حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# مافی مرۆڤ

## بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی و پیشەیی

**دانەران**

**حەمە ساڵح حەمە ئەمین** — **چێنەر عەلی جۆلا**

**وشیار مستەفا خاڵ** — **د. سالار حمە سور باسیرە**

**پێداچوونەوەی زانستی**
**یوسف عوسمان حەمەد**

چاپی نۆیەم ٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی

# تەوەرەی یەکەم

## کورتەیەکی مێژوویی:

لە پەیدابوونی کۆمەڵی مرۆڤایەتیو هاتنەکایەی چەمکەکانی موڵکداریو بەرژەوەندی و دەسەڵاتەوە، ناکۆکی و پێکداپژانو شەڕ هاتوونەتە ئاراوەو تەنانەت دوو جەنگی جیهانیشیان لێکەوتۆتەوە، ئەو دوو جەنگە کارەساتی گەورەو ناهەمواری وایان خستەوە کە بە ملیۆنان کەس گیانی تیادا لەدەستبدەن. هەر لەزووەوە ژیرانی دونیا هەستیان بەو پێشێلکارییە گەورانە کرد کە دژ بە مرۆڤو مرۆڤایەتی دەکران و دەکرێن، بەتایبەتی لەکاتی شەڕو پشێوییەکاندا, بۆیە هەوڵی دانانی سیستمێکی وایان دا کە ڕادەیەك بۆ ئەو پێشێلکارییانە دابنێن.. بەو هۆیەوە بیر لە دانانی چەند بنەمایەك کرایەوە تا مافی تاکە کەسو خەڵکە سڤیلو شەڕنەکەرەکە بپارێزێو بەڵێنی پابەندبوونی دەسەڵاتدارانیش بەو بنەما سەرەکییانە وەربگیرێ..

ساڵی (١٢١٥)، خەڵکی ئینگلتەرا بەڵگەنامەیەکیان بە فەرمانڕەواکەیان واژۆکرد کە چەند مافێکی مرۆڤی تیادا دیاریکرابوو، پەیماننامەکە بە (ماگناکارتا)[1] واتە (پەیمانی مەزن) ناسرا..

لە چەرخی "رێنیسانس"یشدا، لە ئەوروپا کۆمەڵە پیاوێکی زاناو هونەرمەندو کارامە پەیدابوون، بیرۆکەی گرنگی وایان وروژاند کە سەرجەم مرۆڤایەتی پێڕاچڵەکیو رۆڵێکی مەزن لە زەمینە خۆشکردنو گەشەپێدانو چەسپاندنی مافی مرۆڤیشدا ببینن.

---

[1] ساڵی (١٢١٥) دەسەتەڵاتی پاشایەتی لە ئینگلتەرا زۆر لاواز بوو بە تایبەت پاش هاوبەشی کردنی ئینگلتەرا لە جەنگی خاچ پەرستانداو تێکشکاندنی کڵێسای کاسۆلیك ئەم کارە بووە مایەی نارەزایی لە نێوان پیاو ماقوڵان و سوارچاکاندا، لە لایەکی تریشەوە دانیشتوانی شارەکان دژی دەستەلاتی پاشا راپەرین و ناچارکرا پەیماننامەیەکیان لەگەڵدا واژۆ بکات بە ناوی (ماگناکارتا = پەیمانی مەزن)، پەیمانەکە لە (٦٣) بەند پێکهاتبوو، لەو بەندانە: رێکخستنی باج- بەندنەکردنی هیچ کەسێك بەر لە رێنەدانی یاسا- دەستێوەرنەدان لە کاروباری دادگا- هەرکاتێك پاشا پابەندی یاسا نەبێت بۆ پیاو ماقوڵان و دەرەبەگەکان هەبێ دژی بوەستن ))

ساڵی (١٦٤٢)، ( ئۆلیڤەر کرومیل )[٢] سەرکردایەتی شۆڕشێکی بورژوای دیموکراتیانەی لە ئینگلتەرادا کردو شا (شارلی یەکەمی)ی لەناوبردو پەرلەمانێکی پێکهێنا، پەرلەمانەکە لە ساڵی ١٦٨٩دا چەند بنەمایەکی وای دارشت کە ئامانجی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی پاشایەتیو پشتگیریکردنی ئازادییە کەسییەکان بوو. هەر لەو سەردەمەدا فەیلەسوفێکی مەزن بەناوی"جون لوك"ەوە پەیدابوو، بۆچوونو نووسینەکانی خۆیی لەسێ خاڵدا کۆکردەوە:

١- یاسا سروشتییەکان، بێجیاوازی نەژاد، ئایین... هتد، لەرێی هۆشەوە لە ئەزموونی هەستەکانماندا دەناسرێن.

٢- دانانی کۆیلایەتی بە کارێکی نارەوا.

٣- هەموو کەس بۆ پاراستنی ژیانو ئازادی لەمافو ئەرکدا یەکسانە.

راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا، لە (٤)ی تەمموزی (١٧٧٦)دا، بۆ یەکەمین جار جەخت لە راستییەك دەکات کە مرۆڤ لە لەدایکبوونیانەوە یەکسانو پەروەردگار هەندێك مافی لەبنەهاتووی پێبەخشیون، وەك مافی ژیانو ئازادیو گەران بە دوای بەختەوەریدا، حکومەتانیش لەپێناو وەدەستهێنانی ئەم مافانەدا دروستکراون. سیانزە ولایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستووری بنەرەتی خۆیان گۆریو هەشتی دیش ئەو راگەیاندنەی مافی مرۆڤ دەخەنە سەر دەستووری ناوچەکانیان. هەموویان مافە تاکە کەسییەکان وەبیردەخەنەوەو دەڵێن ئەمانە ئازادیی سەرەتایی مەدەنین (سڤیل).

---

[٢] سیاسەتمەدارێکی ئینگلیزیو ئەندام پەرلەمان بووەو سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکارانەی دژ بە شا کردووە, ساڵی (١٦٤٢) جەنگی ناوخۆ لە ئینگلتەرا، لە نێوان پشتگیرانی پاشاو لایەنگرانی پەرلەمان دەستییپێکردو ساڵی (١٦٤٥) بە سەرۆکایەتی (ئۆلیڤەر کرۆمێڵ) سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا.

شۆڕشی فەرەنسا لە تەموزی (١٧٨٩)دا بەرپابوو، لەمانگی ئابی هەمان ساڵیشدا ئەنجومەنی گەل (پەرلەمان) دامەزرێنرا. ئەم ئەنجومەنە سوودی لە هەردوو نموونەی بەریتانیایی‌و ئەمەریکایی لە بواری مافی مرۆڤدا وەرگرت، جگە لەوە سوودی زۆریشی لە بەرهەمەکانی سێ بیرمەندی فەرەنسایی (ژان ژاك رۆسۆ[١]، ڤۆلتێر[٢]، مونتسکیۆ[٣]) وەرگرت. ئەنجومەنەکە مافی مرۆڤو هاونیشتمانی بە (١٧) بەند راگەیاندو لەساڵی (١٧٩١)یشدا خرایە دەستووری فەرەنساوە.

ڕێکەوتننامەی (لاهای)ی ساڵی (١٨٩٩)، ئەو راگەیاندن‌و ڕێکەوتننامانە لەخۆ دەگرێت کە پێویستە لەکاتی جەنگدا پێڕەوی بکرێن، لەوانە ڕێکەوتننامەی لاهای (١٨٨٩)و ڕێکەوتننامەی (١٩٠٧)ی تایبەت بە کاتی جەنگ، لە شێوازکانی ڕێکخستنی خەڵك و بەکارنەهێنانی چەکە کۆکوژییەکان و قەدەغەکردنیان‌و چۆنێتی هەڵسوکەوتی جەنگاوەران‌و پاراستنی گیانی هاووڵاتیانی سڤیل‌و دامەزراوە مەدەنییەکان.

ڕێکەوتننامەکە بەندە بە پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤ لەکاتی جەنگ و پێکدادانداا، باس لە پارێزگاریکردنی دیل‌و زامداران دەکات، ساڵی (١٩٠٧) دەستکاری دەقی ڕێککەوتننامەکە کراو گرنگی زیاتری بە پێکراوی جەنگو

---

[١] ژانژاك رۆسۆ: (١٧١٢– ١٧٧٨)، نووسەرێکی فەرەنسییەو کتێبی لەبوارەکانی فەلسەفەو کۆمەڵایەتیدا داناوەو تیایاندا باسی لە چاکیی مرۆڤ کردووەو داوای گەڕانەوە بۆ سرووشتیان لێدەکات. لە بەرهەمەکانی "پەیمانی کۆمەڵایەتی، ئەمیل، دانپیانان". بنەمای بڕواکانی کاریگەرێتی خۆیان لەشۆڕشی فەرەنسادا هەبوو.

[٢] ڤۆلتێر: (فرانسوا ماری ئەرواى) (١٦٩٤– ١٧٧٨)، لەدایکبووی پاریسە. نووسەرێکی بلیمەتی فەرەنساییە, سەرکردایەتی بزووتنەوەی فەلسەفەی ماتریالی کردووەو بەرەنگاری دەسەڵاتە ئاینیی‌و مەدەنییەکانی بۆتەوەو ڕەخنەی لێگرتوون. شیعرو مێژوو شانۆنامەو نامەگۆڕینەوەو فەلسەفەی نووسیوە.

[٣] مونتسیکۆ: ١٦٨٩ –١٧٧٥ لەگەورە روناکبیرەکانی فەرەنسایە کتێبی (رۆحی یاساکان) مەزنترین بەرهەمیەتی کە تیایدا پێ لەسەر جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (یاسادانان ،جێبەجێکردن، قەزائی) دادەگرێت. مونتسکیۆ، لەپێناو دابینکردنی ئازادیی‌و دادوەریی، داوای کرد بە شێوازی سیستمی ئینگلیزی ئەوکات کە مۆنتسکیۆ بە باشترین جۆرەکانی حوکمی دەزانی، پادشاو چینی ئۆرستۆکراتی‌و چینی گشتی هاوبەشی حوکم بکەن.

دیلو خەڵکە سڤیلەکە دا. دواتریش ساڵی (١٩٤٩) لەجنێڤ لەسەر چوار خاڵی گرنگ ڕێککەوتن، ئەوانیش پارێزگاریکردنی: بریندار‌ی شەڕ، دیل، شوێنە پیرۆزەکان، شوێنە مەدەنییەکان.

پرۆتۆکۆلێك بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی گازی ژەهراویو ماددە بەکتریۆلۆژییەکان، کە بە ئامرازی شەڕی وەحشیگەرییانە دانران, لەجنێڤ واژۆکرا.

## ڕاهێنان

- لەکاتی هەر دوو جەنگی جیهانی و شەڕو پێکدادانەکانی دیدا، مافی تاکە کەس وەك پێویست دەپارێزرا؟
- کوشتارو پێشێلکارییەکان هەر سڤیلی دەگرتەوە؟
- بۆ ڕاگرتنی کاولکاریو ئەو ناڕەواییانەی دژ بە شوێنە پیرۆزەکان دەکرێت, چی کرا؟
- جگە لەدەوڵەتە زیان لێکەوتووەکان لایەنی دی لەسەر ناڕەواییەکانی جەنگ هەڵیاندەدایە؟

## تەوەری دووەم

## قۆناغەكانی پاراستنی مافی مرۆڤ:

پاراستنی مافی مرۆڤ، بەپێی پەرەسەندنو بەرەو پێشەوە چوونی كۆمەڵی مرۆڤایەتی، ئەم قۆناغانەی بەخۆوە بینیوە: قۆناغی دابونەریت، قۆناغی یاسا، قۆناغی دەستووری، قۆناغی نێودەوڵەتی.

### قۆناغی دابونەریت:

دەتوانین بڵێین، مافی مرۆڤ بە شێوەی نەریت لە ناو كۆمەڵدا هەبووە، ئەویش بەهۆی نەبوونی یاسای نوسراوەوە. لەبنەڕەتیشدا نەریت لە دوو بنەمای سەرەكی پێك دێت :

**یەكەم:** بنەمای ماددی, بریتییە لە دووبارە كردنەوە كردارێك یان نەكردنی كردارێك لە بوارێكی دیاریكراودا.

**دووەم:** بنەمای مەعنەوی, بریتییە لە باوەڕهێنان بە كردن یان نەكردنی كارێك كە پابەند بوون پێوەی پێویستە.

كۆن كۆمەڵ لەچەند خێزانێك پێكهاتبوو، بۆیە كامیان خاوەن دەسەڵاتو هێز بوایە، فرمانەكانی لای خەڵكەكە جێگای یاسای ئەمڕۆی گرتبۆوە.. ڕوودانی هەر گرفتێك لە كۆمەڵدا بەرەو ڕووی ئەو دەكرایەوەو ئەویش بڕیاری خۆی لەسەر دەداو ئیتر كەسیش بۆی نەبووە بەرهەڵستی بڕیارەكەی بكات.. دواتر ئەو خاوەن دەسەڵاتە لەهۆزو خێڵدا، ناوی سەرەك هۆزو خێڵی لێنرا.. دوای هاتنەكایەی كشتوكاڵو بەڕێوەبردنی هۆكارەكانی بەرهەمهێنان، خۆسەپێنەران بەپێی دابونەریت كۆمەڵەكەیان بەڕێوە دەبردو زیاتریش بیریان لە بەرژەوەندی خۆیان دەكردەوە وەك لە بەرژەوەندی خەڵكەكەی دی. بەو پێیە كۆمەڵی ئەو سەردەمە بە زەقی دوو چینی سەرەكی تیایدا سەری هەڵدا، ئەوانیش چینی كۆیلەو ئۆرستۆكرات بوون، یەكەمیان نزمترین و دووەمیان بەرزترین چین بوون. لەنێوان ئەم دوو چینەشدا كەمو زۆر چینی

دی سـەری هەڵـداوە، ئـەوانیش بـەپێی دوورو نزیکییـان لەدەسـەڵاتەوە جیاکراونەتەوە، وەك كەسێكی جەربەزەو لێهاتوو کـە هەڵسوڕێنەری کاریـان بووبێ یان لەڕێی ژنو ژنخوازییەوە بایەخیان پێدرابێ.

کەواتە قۆناغی دابونەریت قۆناغێکە تیایدا مافەکان لەڕێگای دابونەریتەوە پـارێزراونو هێـشتا یاسـای نوسـراو لـە ئـارادا نـەبووە، بـەلآم ئەمـەش وا ناگەیەنێت کە لەدوای هاتنە کایەی یاسای نوسراوەوە دابونەریت بـە تـەواوی ڕۆڵی نەمابێ، بگرە تا ئێستا لەهەندێ جێگا دابونەریت ڕۆڵی خۆی هەیـە لـەم بوارەدا.

لەم قۆناغەدا، گەر نەڵێین گشت مافەکان پێشێلکراون، ئەوا کەمترین مافی مرۆڤی تیا پـارێزراوە، چـونکە یەکبینـە مـاف بـۆ خـاوەنهێز بـووە. هـەر بـەو حوکمـە کۆمـەڵ لـەو کاتـەدا چـینایەتییەکی زۆر ئاشـکرای پێـوە دیـاربووە. کۆیلەکان نزمترینو بێبەشترین چین بوون، ئەوانەش کە ئازاد بوونو سـیفەتی هاوولآتیـان هـەبووە چـەند مافێکیـان هـەبووە، وەك: مـافی ژیـان، مـافی موڵکداری، مافی پێکەوەنانی خێزان، مافی کۆیلـەداری، بـەڵکو وەك نـەریتێك پارێزراونو پێڕەو کـراون، هـەر بۆیـە پێـشێلکردنی ئـەم مافانـە زۆر ئاسـانو ئاسایی بووە. دواتر بەهۆی بەرەو پێشچوونی مـەدەنیتیو بەدروسـت بـوونی دەوڵـەتو بـەرفراوانبوونی کۆمـەڵو داهێنـانی تۆمـارکردن، نووسـین بەشێوەیەکی ساکارانە هاتە ئاراوە. پاشان یاسا سەری هەڵدا کە دابو نەریت بە یەکێك لە سەرچاوەکانی دەژمێردرێت.

## راهێنان

- مەبەست لەدابونەریت چییە؟
- ئایا دابونەریت بە سەرچاوەیەك لەسەرچاوەكانی یاسا دەژمێردرێت؟ دەكرێ نموونەیەك لەو ڕووەوە بزانین؟
- ئایا مرۆڤ هەر لە كۆنەوە یاسای نووسراوی هەبووە؟ ئەگەر نەیبووە بۆچی؟
- ئایا كۆمەڵە سەرەتاییەكان بە چ شێوەیەك بەڕێوەچوون؟
- ئایا دابونەریت توانیوێتی بە شێوەیەكی دادپەروەرانە مافی مرۆڤ بپارێزێ؟
- بەو پێیە كۆمەڵی ئەو سەردەمە چۆن كۆمەڵێك بووە؟ مەبەست ئەوەیە "فرە چین بووە یان چۆن؟"

## قۆناغی یاسا:

بە بەرەو پێشچوونی مەدەنیتی و، پێکهاتنی دەوڵەت، یاسا لەلایەن دەوڵەتەوە دانراو بە یاسا نووسراوەکانیش ناسرا. سەرەتا دانانی یاسا رووکەشبوو، چونکە دەستکاری دابونەریتە کۆنەکان نەدەکرا تەنیا دەنووسرانەوە. بەوەش وای لێهات کە بەپێی حوکمەکان خەڵکەکە ببەستنەوە. یاسای حامورابی لە عێراقو یاساکانی صولون لە یۆنانو یاسای دوازدە لەوحەکەی رۆمانییەکان نموونەی ئەو جۆرە یاسایانەن. حامورابی کەنزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش زایین پاشای بابل بووە، یاساکەی لەسەر بەرد نەخشێنراوەو بەیاسایەکی کۆن دادەنرێ. ئەو یاسایە نوسینەوەی دابونەریتە باوەکانی سەردەمی خۆی بووەو باس لە مەسەلەکانی: سزادان، دەستکەوتەکانی (ئیمتیازات) کاربەدەستان، گرێبەستی کرینو فرۆشتن، گواستنەوەی کەلوپەل، وەکالەت، قەرز، دەستبەسەرداگرتن، مەسەلەی کۆیلەداریو خێزانی کردووە.

دەرکەوتنو جێبەجێکردنی یاسا هەنگاوێکی گرنگ بوو لە رووی دیاریکردنو پشتگیریکردنی مافی مرۆڤ، ئەگەر لە سەرەتاشدا بە شێوەیەکی سادە بوبێت بەڵام لە گەشەکردنێکی بەردەوامدا بووە تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ئێستا تیایەتی.

## راهێنان

- بە پەیدابوونی نووسینو فراوانبوونو گەشەکردنی کۆمەڵەکان دەبوا چ شتێك بۆ رێکخستن بکرایە؟
- ئەو پرۆگرامە چ ناوێکی بۆ دانرا؟
- حامورابی کێبووەو چیکردووە؟
- ئایا یاسای حامورابیو ئەو یاسایانەی تریش کە لەو کاتانەدا بەدوایدا هاتن، مافی مرۆڤیان بەچاکی دەپاراست؟
  ئەگەر نا بۆچی؟

## قۆناغی دەستووری:

لەپێناو زیاتر ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی مرۆڤو کۆمەڵ، یاسا پەرەی سەندو دەستووری لێکەوتەوە، کە بەسەرچاوەی یاساکان دەژمێردرێت لە دەوڵەتداو لە کۆمەڵە بنەمایەکی یاسای گشتگیر پێکدێو جۆری سیستمی دەوڵەت دیاریدەکات، پسپۆڕێتی دەسەڵاتەکانی (یاسادانان، جێبەجێکردن، دادوەری)و سەربەخۆبوونیی هەر یەکەیان و جیابوونەوەیان لە یەکتری، ئازادییەکانی تاکەکەسو ئەرکو مافیان، دەست نیشان دەکات.

هەر کۆمەڵێك دەوڵەتی هەبێ، جا قەبارەی دەوڵەتەکە هەرچەندێك بێ، بۆ ڕێکخستنی پێوەندییەکانی پێویستی بە ڕێساو یاسا دەبێ، هەر ئەوەش بووە هۆی سەرهەڵدانی زانستی دەستوور.. وشەی دەستور لە بنەڕەتدا وشەیەکی لاتینیە بە واتای فرمانی ئەباترەکان ڕۆما دبێت, لە زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیشدا (Constitution)ی پێ دەوترێت. لە زمانی کوردیدا (دەستور)ی پێ دەگوترێو بە چەند جۆرێکیش پێناسەکراوە.

بەو پێیە پێوەندییەکی تەواو لە نێوان دەستوور و مافی مرۆڤدا هەیە، چونکە لە لایەك دەستوور سەرچاوەی یاساکانەو مافەکان دەستەبەر دەکات و دەیانپارێزێتو دەیانکاتە مافی دەستووری، لەلایەکی تریشەوە لە ناو یاساکاندا دەیانچەسپێنێت، کە ئەمیان وادەگەیەنێت پێشێلکردنی هەر یەکێك لەو مافانە، گەر دەستەڵاتیش بیکات پێشێلکردنی دەستووری لێدەکەوێتەوە.

هەر لەو چوارچێوەیەشدا لە زۆربەی وڵاتاندا مەرجێکی دەستووری وا دادەنێن تا لەکاتی گۆڕانکاریکردن و چاککردنی بەندەکانی دەستووردا بەهیچ شێوەیەك دەستکاری ئەو مافانە نەکرێت و لێیان کەم نەکرێتەوە.

هەر لە هەمان بواردا، لە وڵاتاندا دادگایەکی باڵا بە ناوی "دادگای باڵای دەستوور"ەوە، هەیە, ئەو دادگایە چاودێری جێبەجێکردنی دەستوور و پاراستنی ئەو مافانە دەکات کە تیایدا هاتوون، دەسەڵاتی هەڵوەشانەوەو

پوچـەڵکردنەوەی هـەر یاسـاو ڕێـساو هەڵسوکەوتێکیـشی هەیـە کـە بـە پێچەوانەیانەوە بێت.

دەستوری خاوەنی چەند گرنگییەکە, لەوانە:

١- دانـانی سـنورێك بـۆ دەسـەڵاتەکان (یاسـا دانـان, جێبـەجێکردن, دادوەریی)و جیاکردنەوەیان لە یەکتری.

٢- دەستور سەرچاوەیەکە بۆ سەرجەم یاساکان.

٣- دیاریکردنی دەسەڵاتی هەریەك لەو دەسەڵاتانەی سەرەوە.

٤- دەستور زامنێکی یاسـاییە بـۆ ئازادییـە گشتییەکانو مافـەکانی تاکـە کەس.

٥- دەستور زامنی بەشداربوونی هەموو کۆمەڵـە سیاسـییەکان دەکـات لـە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا.

لەبەرئـەوەی بەنـدەکانی دەسـتوور لەدەوڵەتـدا، خـاوەن پیرۆزیـیو گرنگییەکی گـەورەن، پێویـستە بـەجۆرێك دابرێـژرێت کـە زۆرینـەی مافـەکان مسۆگەر بکات و ببێتە پاڵپشتێکی گەورە بۆچەسپاندنیان، ئەوەش وا دەکات دڵنیـاییو ئـارامیی لای کۆمـەڵ دروسـتبێت و، تـاکی کۆمـەڵیش ترسـی زەوتکردنی مافەکانی لەلایەن دەسەڵاتەوە برەوێتەوە.

## راهێنان

ـ ئێستا هەر دەوڵەتەو یاسایەکی بنەڕەتیخۆی هەیە، بەو یاسا بنەڕەتییە دەڵێن چی؟

ــ ئەو دەستوورە کە دەبێتە کۆڵەکەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بەو یاسایانە دەتوانێ چی بەدی بێنێ؟

ـ هەموو دەوڵەتەکان پێڕەوی دەستوورەکەی خۆیان دەکەن؟

ــ دەوڵەتێك دەستوورەکەی پێڕەوبکاتو ڕێزی لێبگرێت، چۆن دەوڵەتێکە؟

ـ بڵێی دەستوور لەیەکەمجارەوە بەو جۆرەبووبێ کەباسی لێوەکرا؟ واتە دەسەڵاتداران پابەندی بووبن؟

ـ قۆناغی دەستوورو قۆناغی یاسا کامیان بە پێشکەوتووتر دادەنرێت؟ بۆچی؟

ـ دەستوور لەلایەن دەوڵەتەوە دابنرێت باشە؟ یان لەلایەن نوێنەرانی هەڵبژێردراوی گەلەوە؟

ـ گرنگترین ماف لەدەستووردا کامەیە؟

## قۆناغی نێودەوڵەتی:

ئەگەر مافی مرۆڤ لەقۆناغی دەستووریداو لە بەندە دەستووریەکاندا جێگەی کرابێتەوە ئەوا لەم قۆناغەدا لە رێگەی چەندین پەیماننامەو رێکەوتنامەی نێودەوڵەتییەوە واژۆکێکی[1] نێودەوڵەتیی پێدەبەخشرێ, سنووری دەوڵەتان دەشکێنێو چەمکێکی نێودەوڵەتی لەخۆدەگرێت.

لەم قۆناغەدا چەندین کۆبوونەوەو کۆنفرانس لە نێوان وڵاتاندا بەسترا، هەندێکیان بۆچارەسەری کێشەو گرفتەکانی نێوانیانو هەندێکی تریشیان بۆ جێگیرکردنی یاسا نێودەوڵەتییەکانو ئیمزاکردنی رێکەتننامەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ، لەوانە: واژۆکردنی پەیماننامەیەك بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی، نەهێشتنی بازرگانی کردن بە ماددە بێهۆشکەرەکان، مافی کەمینە چەوساوەکان، رێکەوتننامەی تایبەت بەمافە مەدەنیو سیاسییەکان، پارێزگاریکردنی موڵکداریێتی پیشەسازیو ئەدەبیو هونەریی، بەگژاچوونەوەی جیاوازیکردن بە هۆی رەگەزەوە، جیاوازیی ژنان... هتد. هەروەها پاش نەمانی کۆمەڵەی گەلان, رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی (١٩٤٥) وەك رێکخراوێکی نێودەوڵەتی دامەزرا, کە سەرکەوتووانە توانیویەتی تا ئاستێکی باش برەو بە مەسەلەکانی ماف مرۆڤ بداو لە رێگەی کارکردنیەوە پرنسیپەکانی ماف مرۆڤ بچەسپێنێت.

---

(١) واتە تصديق

## تەوەری سێیەم

## نەتەوەیەکگرتووەکان و مافی مرۆڤ:

پاش هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانیی و شکستهێنانی کۆمەڵەی گەلان لە پاراستنی ئاشتیی جیهانیی و پێکهێنانی پەیوەندییەکی ئاسایی و دوور لە جەنگ لە نێوان دەوڵەتاندا، بۆ یەکەمجار (فرانکلین د. روزفیلت)ی سەرۆکی ئەمەریکا، ناوی نەتەوە یەکگرتووەکانی هێنا لەو راگەیاندنەی کە تێیدا ٢٦ حکومەت بەڵێنیاندا بەردەوامبن لە بەگژاچوونەوەی هێزەکانی "میحوەر".





کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان

کاتێك کۆنگرەی نەتەوەیەکگرتووەکان کە لە (٢٥ – ٢٦ نیسانی (١٩٤٥) لە سانفرانسیسکۆ بەسترا، (٥٠) دەوڵەت بەشداریان لە دانانی میساقەکەیدا کرد، ئەویش بەپێی ئەو پێشنیازانەی نوێنەرانی یەکێتی شۆرەوی و چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ئابی (١٩٤٤)دا کردبویان. لە رۆژی (٢٦)ی حوزەیرانی (١٩٤٥)دا، هەر (٥٠) دەوڵەتەکەو پۆڵەندا، کە نوێنەری لە کۆنگرەی دامەزراندندا نەبوو، واژۆیانکرد، بەو پێیە بوونە (٥١) دەوڵەت..

قەوارەی نەتەوە یەکگرتووەکان، رۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی (١٩٤٥) بە رەسمی ناسرا، ئەویش دوای ئەوەی هەریەك لە" یەکێتی شۆرەوی و چین و فەرەنساو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو زۆربەی وڵاتەکانی تریش واژۆی خۆیان لەسەردانا..

لـه پێشەکی بڕوانامەکەیدا کـە بـە دەسـتووری نەتـەوە یـەکگرتووەکان دەناسرێت هاتووە: "ئێمەی گـەلانو نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـەڵێن دەدەیـن نەوەکانی داهاتوو لە جەنگو کارەساتەکانی بپـارێزین، لـە هـەمان بواریـشدا پەیمان نوێ دەکەینەوەو باوەڕبوونمان بە مافەکانو بـەوەی کـە پیـاو و ژنو نەتەوە، بە گەورەو بچووکیانەوە، ماڤ یەکسانو چونیەکیان هەیە".

ساڵانەش لە (٢٤)ی تشرینی یەکەمـدا، بـەو بۆنەیـەوە لـە هـەموو دونیـادا ئاهـەنگ سـازدەکرێ.. ئێـستا ژمـارەی ئەنـدامانی نەتـەوە یـەکگرتوەکان گەیشتۆتـە (١٩١) دەوڵەت..[1]

ئەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە، لەپاڵ چەندین ئامانجی خۆیدا، دوو ئامـانجی سەرەکی هەیە:

١ـ ئاشتییەك، لەسەر بنەمای یەکسانی نێوان گەلانو مافی چارەنووسیان بنیات بنرێ.

٢ـ بێ جیاوازیکردنی" ڕەگەز، زمان، ئایین, ڕەنگ یان نەتەوە، مافی مرۆڤ بچەسپێنرێ.

نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە (١٩٤٨/١٢/١٠)دا، جارِنامـەی جیهـانی مـافی مرۆڤی، لە (٣٠) بەندا راگەیاند، کە ئەم مافانەی لەخۆ گرتبوو: (مافی ژیان، سەربەستی، سەلامەتی کەسێتی، یەکسانی لەبەردەم یاسا، دوورکەوتنەوە لە گرتنـی هەڕەمەکیانـە، دادگـاییکردنی ئاشـکرا، ئـازادی هاتوچـۆکردن، مـافی پەنابەردنە بەر هەر وڵاتێك، مافی ڕەگەزنامە، هاوسەرێتی، موڵکداری، مـافی رادەربڕین، بەشداربوون لەبەڕێوەبردنی وڵات، ئازادی دەنگدانو خۆپـاڵاوتن).

ساڵی (١٩٤٩) لەشـاری جنـێڤ رێککەوتننامەیـەکی تایبـەت بـە چۆنیەتی پاراستنی ماڤ مرۆڤ لە کاتی جەنگدا واژۆ کرا کـە گـرنگترین خاڵـەکانی بـریتی بوون لەپارێزگاریکردنی" برینـداری شـەڕ، دیـل، شـوێنە پیرۆزەکـانو شـوێنە

---

(١) خوێندکاری بەڕێز, بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: (**www.un.org**).

مەدەنییەکان، ئەم خالانە پاش دەستکاریکردنی رێککەوتننامەی (لاهای)ی ساڵی (١٨٩٩)هات ، کە بەندە بە پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤ، لەکاتی شەڕوشۆڕداو باس لەپارێزگاریکردنی دیلو زامداران دەکات.

دواتریش لە ساڵی (١٩٥٥- ١٩٦٦)، ئەندامانی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ئالوگۆڕی بیروڕاو لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلیان لەمەڕ مافە مەدەنیو سیاسییو رۆشنبیرییو کۆمەڵایەتییەکان کرد، تا لە ١٩٦٦/١٢/١٦دا دوو رێکەوتننامەی جیاوازو پرۆتۆکۆلێکی ئارەزوومەندانەیان راگەیاند، رێکەوتننامەی یەکەم تایبەتە بەمافە مەدەنیو سیاسییەکانو لە (٥٣) بەند پێکهاتووەو، (١٢٤) دەوڵەت واژۆیان کردووەو پابەندێتی خۆشیان پێوەی راگەیاندووە... ئەم رێککەوتننامەیە بانگهێشتی وڵاتان دەکات بۆ دانانی رێوشوێنی گونجاو لەپێناو پاراستنی ئەو کەمایەتییە نەتەوەییو ئایینیو رەگەزییانەی، لەچوارچێوەی وڵاتەکانیاندا دەژین. بەپێی چەند بەندێکی رێککەوتننامەکە، نەتەوەیەکگرتووەکان "کۆمیتەی مافی مرۆڤ"ی بۆ چاودێریو جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە پێکهێناوەو وەرگرتنی سکاڵای هاوڵاتیانی ئەو دەوڵەتانەی کە رێککەوتننامەکەو پرۆتۆکۆلە ئیختیارییەکەیان واژۆکردووە، پێسپێردراوە..

دووەم رێکەوتنامە، تایبەتە بەمافە ئابوریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکان، لە دیباجەیەكو (٣١) بەند پێکهاتووە، کە باس لە (مافی کارکردنو ئاستی باشی گوزەران، دادوەری لەدەستکەوتنی کاردا، مافی خێزان و منداڵ لەڕووی پاراستنو پەروەردەو فێرکردن.....هتد) دەکات.

نەتەوە یەکگرتووەکان دەستەبەرکردن بەجێهێنانی مافی مرۆڤو ئازادییە بنەڕەتییەکانی، وەك ئامانجێکی سەرەکی دیاریکردووە. وڵاتان بە دەستەبەرکردنو پاراستنیانەوە، پابەند دەکات.

نەتەوە یەکگرتووەکان چەندین دەزگای تایبەتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هەیە, کە بریتین لە:

أ- ئەنجومەنی ئاسایش.

ب- کۆمەڵەی گشتیی.

ج- ئەنجومەنی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتی.

هـ- دادگای دادی نێودەوڵەتی.

ز- رێکخراوی کاری نێودەوڵەتی.

د- ئەنجومەنی راسپاردەکان (مجلس الوصایا).

کە کۆمەڵێك لیژنەیان هەیە, بریتین لە:

لیژنەی گەشەپێدانی بەردەوام, لیژنەی مافی مرۆڤ, لیژنەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی, لیژنەی پێگەیاندنی ژنان, لیژنەی نەهێشتنی تاوان‌و دادپەروەریی جیهانیی, لیژنەی زانستی‌و تەکنەلۆژیاو لیژنەی کۆمەڵە مرۆییەکان.

بۆ چەسپاندنی بنەماکانی مافی مرۆڤ نەتەوە یەکگرتووەکان بە چەند ئاراستەیەك کاردەکات:

**یەکەم:** بڵاوکردنەوەی راگەیاندن‌و بنەماو راسپاردەکانی مافی مرۆڤ، بۆ نموونە:

* جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ (١٩٤٨).
* راگەیاندنی مافی منداڵ (١٩٥٩).
* راگەیاندنی سەربەخۆییدان بە گەلان (١٩٦٠).
* راگەیاندنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لەناوبردنی جیاوازیکردن (١٩٦٣).
* راگەیاندنی لەناوبردنی جیاوازیکردن دژی ژن (١٩٦٧).
* راگەیاندنی لەناوبردنی برسێتی (١٩٧٤).
* راگەیاندنی مافی گەشەکردن (١٩٨٦).
* راگەیاندنی پاراستنی کەمینەکان (١٩٩٢).
* راگەیاندنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ لەناوبردنی توندڕەویی‌و جیاوازیکردن (٢٠٠١).

**دووەم:** دارشتنو پەسەندکردنی چەندین پەیماننامەو رێککەوتننامەی نێودەوڵەتی بواری مافی مرۆڤ، کە وڵاتان دەبێت بە واژۆو پەسەندکردنیان لەناو دەستووروو یاساکانیاندا شوێنیان بکەنەوە, لەوانە:

* رێککەوتننامەی لەناوبردنی کۆمەڵکوژی (١٩٤٨).
* رێککەوتننامەی ژنێف (١٩٤٩).
* رێککەوتننامەی قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە مرۆڤ (١٩٤٩).
* رێککەوتننامەی مافی سیاسی ژن (١٩٥٢).
* رێککەوتننامەی مافە مەدەنییو سیاسییەکان (١٩٦٦).
* رێککەوتننامەی مافی ئابوورییو رۆشنبیرییو کۆمەڵایەتییەکان (١٩٦٦).

لە ئاستی هەرێمایەتیو ناوچەیی بواری مافی مرۆڤدا، گەشەکردنێکی بەرچاوی هەیە, چەندین پەیماننامەی هەرێمایەتیو کیشوەری کاردەکەن بۆ پاراستنی دەستەبەرکردنی مافی مرۆڤ، وەك: هەردوو رێککەوتننامەی ئەوروپا و ئەمەریکا بۆ مافی مرۆڤ.

نەتەوە یەکگرتوەکان وەك رێکخراوێکی نێودەوڵەتی رۆڵی گەورەی لە بەنێودەوڵەتیکردنی مافەکانی مرۆڤ هەبوو، لە رێگەی رێکخستنو ئامادەکردنی رێککەوتننامە نێودەوڵەتیەکانی تایبەت بەم بوارەو پێکهێنانی دەزگای تایبەت بە چاودێریکردنی مافی مرۆڤ لە گشت ناوچەکانی جیهاندا.

سێیەم: سەرپەرشتی کردنی هێزی ئاشتی پارێزو دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکان لە کاتی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤدا:

پاش ئەو گۆرانکارییە گەورانەی کە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا هاتە کایەوە نەتەوە یەکگرتووەکان توانی سەرکەوتووانە سەرپەرشتی هێزی ئاشتی پارێز بکات لە چەندین دەوڵەتی جیادا بە مەبەستی نەهێشتنی جەنگو پاراستنی خەڵکانی مەدەنی لە دەستدرێژییو پێشێلکردنی مافەکانیان, هەروەها لە کاتی پێشێلکردنی ترسناکی مافەکانی مرۆڤ نەتەوە یەکگرتووەکان رێگەی بە خۆی داوە کە دەست وەربدات لە

کاروبــاری نــاوخۆی دەوڵــەتان تەنانــەت ئەگــەر پێویستیــشی کــرد هێــز بــەکاریهێنێت بــۆ راگــرتنی پێــشێلکارییەکان, وەك بڕیــاری (٦٨٨)ی ســاڵی (١٩٩١)ی تایبەت بە عێراق.

## تەوەرەی چوارەم

### خەسڵەتەکانی مافی مرۆڤ:

مافی مرۆڤ چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوی هەیە. ئەمانەی لای خوارەوە دیارترین خەسڵەتەکانی مافی مرۆڤن:

١- مافی مرۆڤ ناکڕدرێتو نافرۆشرێت، خەڵاتێکیش نییە کەسێك بەخشیبێتی، بەڵکو موڵکی مرۆڤایەتییە بە خەسڵەتی مرۆڤبوونیانەوە بەندە، مافی مرۆڤ بۆ هەموو کەسێك مافێکی ڕەسەنەو پێوەی لکاوە.

٢- مافی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا مافی هەموو کەسێکە بێگوێدانە " ڕەنگ، ڕەچەڵەك، ئایین، ڕەگەز، بیروڕای سیاسی یان بنەچەی کۆمەڵایەتی... هتد. ئێمە هەموو بە سەربەستیو یەکسانیو چوونیەك لە شکۆمەندیو مافدا لەدایکبووین، لەم ڕاستییەشەوە کەواتە مافی مرۆڤ لە شێوەو ناوەرۆکدا مافێکی جیهانییە.

٣- نابێ بەهیچ جۆرێك لە مافی مرۆڤ کەمبکرێتەوە، چونکە کەس بۆی نییە لەبەر هەر هۆیەکبێ کەسێکی دی لەومافانە بێبەشکات، تەنانەت ئەگەر یاسای وڵاتێکیش دان بەومافانەدا نەنێو پێشێلیکات، لە نرخی کەم ناکاتەوە. پێشێلکردنی مافەکان، نەبوونیان ناگەیەنێ.

٤- مافی مرۆڤ یەك یەکەیەو بەشبەش ناکرێ، چونکە مافی مرۆڤ گەر مافی مەدەنیبێ یان سیاسی یان مافی ئابووریو کۆمەڵایەتی, هەموویان پێکەوە یەك یەکە پێکدەهێنن.

٥- مافی مرۆڤ یەکبینە لەبەرەوپێشچووندایەو بە مرۆڤێتی مرۆڤەوە بەندە، چونکە پێویستی مرۆڤ لە ڕووی مادیو مەعنەوییەوە لە پەرەسەندنی بەردەوامدایە، ئەوەش وا دەگەیەنێ کە ئەرکو مافەکانیشی لە پەرەسەندندابێو ببێتە فاکتەرێك بۆ پۆلێنکردنی چەندین مافی تر. دەکرێ بڵێین: مافی مرۆڤ کۆڵکەی هاوبەشی کۆمەڵو شارستانیەتە جۆراوجۆرەکانە.

٦- فێرکردنــی مــافی مــرۆڤ کــارێکی زۆر گرنگــە، چــونکە بەشــێوەیەکی ســەرەکی رۆڵــی لــە یــەکتربوردنو دادوەریــی نــاو کۆمــەڵو دامــەزراوەکان بــە گشتیی دەبینێ.

٧- مــافی مــرۆڤ وەك خــۆی نامێنێتــەوە ، بــەردەوام لەپەرەســەندندایە ، تەنانەت گەیشتووە بەوەی کە تەنیا بایەخ بە مافی تاك نــەدات، بــەڵکو مــافی ئابووریو کۆمەڵایــەتیش بگرێتــەوە، کــە بەوەچــەی دووەم دەناســرێ. مــافی کۆمــەڵیش، وەك مــافی گەشــەکردنو پەرەســەندنو کــەشو هــەوای خــاوێنو ئاشتی جیهان، وەچەی سێیەمە.

٨- مافــەکانی مــرۆڤ پێوەندییــەکی تونــدو تــۆڵ پێکیانــەوە گرێدەدا، بــە جۆرێــك پێشخــستنی هــەرکام لەمافــەکان لەســەر حــسابی یــەکێکی دییــان مــەحاڵبێ. مــافی مــرۆڤ، جــا چ مــەدەنییو سیاســییەکانی، یــان ئــابوورییو کۆمەڵایــەتییو ڕۆشــنبیرییەکانبێ، مافگــەلێکی یەکسانو مەحاڵــە لەیەکدی جیابکرێنەوەو دەوڵەتانیش بەپێی یاسا دەبێ کارێك بکەن هاوڵاتییەکانیان بە مسۆگەری چێژ لەمافەکانی خۆیان وەرگرن. ڕاستیی ئەوەش کــە مــافی مــرۆڤ یەك یەکەی لێکدانەبڕاوە، نەتەوە یەکگرتووەکان یەکبینە، لە ڕێی ئەو ئەرکــە جۆراوجۆرانەیەوە شتەکان یەکلادەکاتەوە کــە پێوەنــدبێ بــەمافی مرۆڤــەوە، بگرە لەو ڕووەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکرێ، کە بەڵگەنامەیەکی مافی مرۆڤ نییە یەك یەکەیی و پێکەوەگرێدانی مافی مرۆڤ یەکلا نەکاتەوە. لە ڕاگەیاندنی کــۆنگرەی جیهــانی مــافی مرۆڤــدا کــە لــە لــەماوەی (١٤- ٢٥)ی حــوزەیرانی (١٩٩٣)دا لە "ڤیەنا" بەسترا، هاتووە: "گــشت مافــەکانی مــرۆڤ یــەك یەکــەی پێکەوە گرێدراو و لکاوەو لە یەکدی جیاناکرێنەوە.

## پۆلێنکردنی مافەکانی مرۆڤ

لەبەرئەوەی مرۆڤ جەمسەری هەموو مافەکانەو سەرجەمی ئەو مافانەش لەپێناو بەرژەوەندی ئەودایەو بە پێوەرەێکیش کە مافی مرۆڤ لە قۆناغی گەشە سەندندا، بە چەندین قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوەو لەگەڵ ئایدۆلۆژیاو بیرە جیاوازەکاندا ڕێچکەی بەستووە. کەوتۆتە ژێر کاریگەریی سیاسییو ئابوورییو یاساییو ئایینیو کۆمەڵایەتیو بیرو باوەڕەوە، بۆیە چەندین جۆر کۆمەڵە مافی بۆ دەستەبەرو گەڵاڵە کراوە، کە هەریەکە پێکهاتەو سیمای تایبەتی خۆی هەیە، ئەوانیش پێکەوە، مافی مرۆڤ پێکدەهێنن، ئەو مافی مرۆڤەی پێوەری بنەڕەتی ژیانی گونجاوو مەدەنییەو ئامانجی هەر پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتیشە.

لەو گۆشە نیگایەوە مافی مرۆڤ بە چەندین شێوازو جۆر پۆلێن کراوە، لێرەدا تەنیا مافە مەدەنی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیو ئابوورییو رۆشنبیرییەکان دەخەینە ڕوو.

## تەوەری یەکەم

### مافە مەدەنیو سیاسییەکان:

ئەو جۆرە مافانەن کە بە مافە کلاسیکییەکان ناسراون، بە چوارچێوەی دەستەبەرکردنی ئازادیو مافی تاكو ڕێگرتن لە دەستێوەردانی حکومەتو چالاکییەکانی مرۆڤ دەخولێنەوە. بەهۆی گرنگیو کاریگەرێتیان لە بنیاتنانی مرۆڤو پێکهێنانی کۆمەڵی مەدەنی، لە چەندین پەیماننامەو ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتیدا، شوێنیان بۆ کراوەتەوەو پێگەی جیهانیو نێو دەوڵەتیان بۆ دیاریکراوە، پەیماننامەی مافە مەدەنیو سیاسییەکانی ساڵی (١٩٦٦) کە لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە پەسەندکرا، گرنگترینی ئەو پەیماننامانەیە، کە دەبێ دەوڵەتان جێبەجێی بکەنو لەم ڕێگەیانەی خواریشەوە پابەندیبن:

أ– ئەنجامدانی چاکسازی یاساییو دەستووری.

ب– ڕەخساندنی زەمینەیەك بۆ مرۆڤ تا سکالاو شکات رابگەیەنێ، تەنانەت گەر پێشێلکارو شکاتلێکراو دەوڵەتو دەزگاکانیشیبن. لێکۆڵینەوەو بینینی سکالاکانیش، دەزگایەکی دادوەریی گونجاوو یاسایی دادپەروەری وایان بۆ زامنو مسۆگەربکرێ، تا هەر بڕیارێکی دادگا کە لە بەرژەوەندی سکالاکەر دەربچێت، جێبەجێبکات.

### دەگونجێ لێرەدا ئاماژە بۆ هێڵە گشتییەکانی ئەو مافانە بکرێت:

١– مافی گەلو نەتەوەکان لەدیاریکردنی چارەنوسو کەڵك بینین لە بەکارهێنانی ئازادانەی سەروەتو سامانە سروشتییەکان.

٢– مافی ژیان، دەبێت لە ڕێی یاساوە بپارێزرێتو کەسیشی لێبێبەش نەکرێت.

٣– قەدەغەکردنی ئەشکەنجەو ئازارگەیاندن بە جەستەی مرۆڤ، سزای قورس و کەرامەتشکێنی بەرەوڕوو نەکرێتەوە.

٤– قەدەغەکردنی کۆیلەیەتیو کارپێکردنی ناڕەوا بە مرۆڤ.

٥- پاراستنی باری ئاسایشی کەسێتی مرۆڤ و قەدەغەکردنی گرتنی نارەوا.

٦- لەبەردەم یاساو دەسەلاتی دادوەریدا یەکسانبن .

٧- ئازادی بیرو راو ئایین.

٨- پێکهێنانی کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسییەکانو بە ئەندامبوون تیایاندا .

٩- مافی خێزانو هاوسەرگرتن.

ئەم مافانەی خوارەوە نموونەی چەند مافێکی سیاسیانەن:

## یەکەم: مافی دروستکردنی کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسییەکان:

مافی رادەربڕین یەکێکە لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ، پێوەرێکە لە پێوەرەکانی دیموکراتیانەی هەر سیستمێکی سیاسی. مافی رادەربڕین بە تەنها ئامانج نییە، بەڵکو هۆکارێکە، لە پێناو بەرژەوەندییە گشتییەکاندا، هەوڵ بۆ چارەسەری کۆمەڵ و دەزگاو دەربڕینی جیاوازو پەرەپێسەندنیان و گەشەپێدانیان دەدات، چونکە مافی رادەربڕین بانگەشەکردن نییە، بەڵکو مەرجێکی هێنانەدی کۆمەڵی ئازادە. ئەگەر بواری ئاسان بۆ وەرگرتنی زۆرترین زانیاری نەڕەخسابێ ئەوا مافی رادەربڕینیش نابێ. دەبێ شتێك بزانیت، واتە زانیاریت لابێت تا باری سەرنجو رایەکی وات لا گەڵاڵەکات کە ئامانجەکەی بەرژەوەندی گشتیو بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵ بێت، ئینجا لە بارەیەوە بدوێیت. مافی ئازادی بیرورا سێ ئاست دەگرێتەوە: گەڕان بەدوای ڕاستی، کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەیەوە، بیرکردنەوەو بەئەقڵکردن تا بگەیتە ئەنجامو ئینجا راکەت دەربڕی.

دەکرێت بڵێین ئازادی رادەڕبرین دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کارێکی دیکە ئەویش لە دروستبوونی کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسییەکاندا بەدیاردەکەوێت. بۆیە پێویستە مرۆڤ ئارەزوومەندانە ئەو کۆمەڵو رێکخراوە سیاسیانە هەڵبژێرێ کەخۆی مەبەستێتی، بەپێچەوانەی هەندێ لەورێکخراوە

سیاسیانەی لەوڵاتێکدا دەسەڵات دەگرنە دەست، بەچەندین ڕێگەی نادروست خەڵکی ناچار دەکەن بچنە ناو ڕێکخستنەکانیانەوە.

ئازادی بە مانا فراوانەکەی زۆر لایەن دەگرێتەوە، یەکێك لەو لایەنانە، مافی دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکانە. کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکان لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی چالاکی سیاسیانەی پەیوەست بە کێشە سیاسییەکان دێتەکایەوە. ئاشکرایە، زۆربەی وڵاتانی دونیا فرە نەتەوەو ئایین‌و چینن ومرۆڤەکانیان خاوەنی بیروڕای جیاوازن ، بۆیە دەشێ خەڵکانی سەر بە هەر یەکێکیان کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسیی تایبەت بە خۆیان هەبێ.

## ڕاهێنان

ـ مەبەست لەکۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکان چییە؟

– ئایا کۆمەڵەیەك یان ڕێکخراوێکی سیاسی بە تەنیا کەسێك دادەمەزرێنرێ؟

ـ ئایا یاسایەکی دیاریکراو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکان هەیە؟

ـ دەکرێ نەتەوەیەك، ئاینێك یان چینێك، زیاتر لە ڕێکخراوێکی سیاسی هەبێت؟

ـ دەشێ یاسا ڕێگا بە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سیاسی وا بدات، کە کوشتن‌و کاولکاری‌و شەڕو ئاژاوە بەرپاکات، یان پڕوپاگاندە بۆ مەبەستێکی لەو بابەتە بکات؟

## دووەم: مافی هەڵبژاردن

گشت دەسەڵاتدارانی دنیا، سیستمی بەڕێوەبردنیان هەرچۆنێك بێ، دان بەوەدا دەنێن کە: " گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە". پێشتر کە ڕێژەی دانیشتوانی شارێك یان ناوچەیەك بە رادەی ئێستا نەبوو، بۆنموونە لەیۆنانی کۆن لەشوێنێکی ئەسینای پایتەختدا، هەموو ئەو کەسانەی بۆ دەنگدان دیاریدەکران کۆدەکرانەوەو سەبارەت بە کێشەی پێوەند بە شارەکەیان رایان وەردەگیرا. بەڵام لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا، کە هەم ژمارەی دانیشتوانو هەم ژمارەی دەنگدەران زیادبووەو بەردەوام لەزیادبوونیشدایەو هەم بەرینی مەودای دەسەڵات هێندە زۆربووە کۆکردنەوەی ئەو دانیشتوانەو یەکلاکردنەوەی کێشەکەو بڕیاردانیو زانینی





بەشدایکردن لەهەڵبژاردن مافێکی ئاسایی هەموو هاووڵاتیانە

خواستەکەیان، مەحاڵبێ، بۆیە هەر وڵاتەو بە گوێرەی یاساو دەستوورو ژمارەی دانیشتوانەکەی، بۆ هەر چەند هەزار کەسێك نوێنەرێك دیاریدەکات. پێشتر سەرۆك هۆز یان شای وڵات نوێنەرەکانی دەستنیشان دەکردو کەسیش بۆی نەبوو لە بڕیارەکەی دەرچێ. تا کار گەیشتە هەڵبژاردنی ئاشکراو دواتر بە ڕێگەی دەنگدانی نهێنی. سەرەتا لەزۆربەی وڵاتاندا تەنیا کەسانێکی دیاریکراو، کە پیاوماقوڵانیان پێدەوترا، مافی دەنگدانیان بووە.

دواتر بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵو پەرەسەندنییەوە، لەزۆر وڵاتدا کۆمەڵەو رێکخراوی سیاسیو کۆمەڵایەتییو رۆشنبیریی هاتە کایەوەو ئەو مافە بۆ سەرجەم نێرینەکانی وڵات، کە لەتەمەنێکی دیاریکراودابن دەستەبەرکرا, تا ماوەیەکی زۆر مێینەی لێبێبەشکرا. ئەگەرچی ئێستا لەزۆربەی وڵاتانی دونیادا ئەو مافە بۆ مێینەش دەستەبەرکراوە، بەڵام هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی مافی دەنگدانو جیاوازایی نەکردنیان لەگەڵ نێرینەدا، لە سەراپای دونیادا بەردەوامەو کراوەتە ئەرکێکی سەرەکی زۆربەی رێکخراوە مرۆییو سیاسییەکان.

گەلێك لەزانایانی ئەم بوارە هەڵبژاردن بە مافێکی مەدەنییو سیاسیی هاووڵاتی دادەنێن کە سەربەستبێ لە بەکارهێنانیا، بەواتایەکی دی هەڵبژاردنو دەنگدان لەژێر هیچ جۆرە فشارێکدا نەبێو بە هیچ شێوەیەك زۆری تیادا بەکارنەهێنرێ.

سەبارەت بەهەڵبژاردن سێ تیۆر هەیە:

**یەکەم: تیۆری مافی کەسیەتی..**

بیریارانی ئەم رێبازە پێیان وایە هەڵبژاردن مافێکی تاکە کەسە, بە پێوەری هاولاتێتی, مافی هاووڵاتیبوونی چونیەك دەستەبەردەکات, بۆیە نابێت کەسی لێبێبەش بکرێت واتە مافی هەڵبژاردن مافێکی ئارەزوومەندانەیە، بۆیە دەتوانێت بەشداریی بکات یان بەشداریی نەکات.

**دووەم : تیۆری وەزیفی :**

هەندێکی تر پێیان وایە هەڵبژاردن ئەرکە نەك ماف، ئەمەش وادەکات مرۆڤ ناچاربێت لەسەر بەشداربوون, لە هەمانکاتیشدا دەبێتە هۆیە بۆ سنوردارکردنی ئازادییەکان و بێبەشکردنی هاووڵاتیان لە ئازادیی مافی بەشداربوون یان بەشدار نەبوون.

### سێیەم: تیۆری یاسایی:

بیریارانی ئەم تیورە پێیان وایە هەڵبژاردن دەسەڵاتێکی یاساییەو یاسا بۆ دەنگدەر مسۆگەردەکات و مەرجو شێوەو ڕێکخستنی بە یاسا دەکرێت . واتە بە دەسەڵاتکردنی یاسای هەڵبژاردنە. هەڵبژاردن لە بەرژەوەندی کۆمەڵ، نەك تاك، دادەنێ. ناوەرۆكو مەرجەکانی بەکارهێنانی بەپێی یاساو بەشێوەیەکی یەکسان بۆ سەرجەم دەنگدەران دابین دەکرێت، بێ ئەوەی ڕێگە بە کەسێك بدرێت، چۆنی بوێ ناوەرۆك یان مەرجەکانی بگۆڕێت..

## ڕاهێنان

- تەمەن پێوندی بە هەڵبژاردنەوە هەیە؟
- تۆ هەڵبژاردن بە ماف یان بە ئەرکی تاکەکەس دادەنێی؟ بەڵگەت چییە بۆ وەڵامەکەت؟
- هەڵبژاردن نیشانەی دیموکراتییەتە؟ بۆچوونەکەت روون بکەرەوە.
- شێوەکانی هەڵبژاردن کامانەن؟
- ئەگەر هەڵبژاردن ئەرکبێ، دەنگدەر لە بەشداریکردنو نەکردنی هەڵبژاردنەکەدا ئازاد دەبێ؟ لەوەڵامەکەت بکۆڵەرەوە.
- بە رای تۆ، بە ئەرککردنی هەڵبژاردن ئازادی تاکەکەس بەرتەسك دەکاتەوە یان نا؟ نموونە بۆ وەڵامەکەت بهێنەرەوە.

## سێیەم: مافی خۆپیشاندان:

یەكێك لەمافە مەدەنییو سیاسییەكانی مرۆڤ، دەربڕینی نارەزایی یان خۆشییە. نارەزایی یان خۆشی بەچەند شێوازێك دەردەبڕدرێن، یەكێكیان خۆپیشاندانە..



نمونەی خۆپێشاندانی هێمنانە

خۆپیشاندان مافێكی سیاسیانەی مرۆڤە، بۆ دەربڕینی نارەزایی یان هاتنەدی مەبەستێك, كۆمەڵێك یان چەند كۆمەڵێك بەكاردەهێنرێ... بەڵام كە بۆ نارەزاییبێ، پێویستە پێشتر چەند هەوڵێك بۆ چارەسەری كێشەكە درابێو هەموو رێگە یاساییەكان گیرابنەبەرو سوودی نەبووبێ، كە هیچ رێگەیەك نەما، پاشان پەنا بۆ خۆپیشاندان ببرێ.



نمونەی خۆپێشاندانێك كە توندو تیژیی تێدا بەكارهاتووە

خۆپیشاندان لـه زۆربـەی دەوڵـەتانی جیهانـدا بـە ئـارەزوو نـاکرێ، بـەڵکو بەپێی یاساو مۆڵەت وەرگرتن لە دەوڵەت پیادەدەکرێ، ئەگـەر وانـەبوو ئـەوا دوورنییە دەوڵەت بە سەرپێچیکردنی یاسـای لـە قەڵـەم بـدات، چـونکە مـافی خۆپیشاندان مافێکی رەها نییە تا هەرکەسێك هەستێو سەربەخۆ سازیبکات. بۆیە زۆرجـار لـە خۆپیـشاندانەوە پـشێوی دەکەوێتـەوەو مـافی کەسـانی دی تیادا پێشێلدەکرێ.. پێویستە ئەو کەسـانەی داوای مۆڵـەتی خۆپیـشاندانەکە دەکـــەن، لیژنـــەی سەرپەرشـــتی بـــنو بەئاشـــکراو بـــە روونـــی مەبەســـتی خۆپیشاندانەکە رابگەیەننو رێچکەو شوێنەکەشی دیاریبکەنو لێـی لانـەدەن. پێویستە دەوڵەتیش مۆڵەت بە ئاسانی ببەخشێت و ئەوسا ئـەرکی ئاسـایشو پۆلیس پارێزگاریکردنی خۆپیشاندەرانو خۆپیشاندانەکە دەبێت نـەك گـرتنو راوەدونانیان.

دەوڵـەت هەیـە رێگـا بـە کـەس نـادات خۆپیـشاندان لـە دژی بکـات، بۆیـە زۆرجـــار لـــە ســـایەی رژێمـــە دیکتاتۆرییەکانـــدا، لایەنـــە بەرهەڵـــستکارەکان خۆپیشاندان بە شێوەیەکی نهێنی رادەگەیەنن، چونکە نارەزایی دەربـڕین لـە رێـی خۆپیـشاندانەوە قەدەغەیـە، لـەو کاتانـەدا شـەڕوپێکدادان لـەنێوان خۆپیشاندەرانو پۆلیسدا بـەرپادەبێو هەنـدێجار چەکیـشی تیـادا بـەکاردێو کارەساتی گەورەشی لێدەکەوێتەوە.

## ڕاهێنان

ـ تۆ بەشداری هیچ خۆپیشاندانێکت کردووە؟

ـ پێت خۆشە بەزۆر بتخەنە ریزی خۆپیشاندەرانەوە؟

ـ هەموو دەوڵەتێك رێدەدا نارەزایی لەڕێگەی خۆپیشاندانەوە بکرێ؟

ـ ئەگەر کۆمەڵەیەك یان ڕێکخراوێکی سیاسیی کێشەیەکی لەگەڵ لایەنێك یان دەزگایەکدا هەبێ، دەکرێ یەکسەر خۆپیشاندان بکات؟

ـ ئەگەر نا، تۆ کام رێگەیەیان نیشان دەدەیت؟

ـ مەرجە هەموو خۆپیشاندانێك سیاسیی بێت؟

ـ کەس لەئێوە بەشداری خۆپیشاندانێکی کردووە، دەسەڵاتدارانی شارەکەی لێئاگادار نەکرابێ؟

ـ لە سایەی دەوڵەتە دیکتاتۆرییەکاندا، ئایا رێ بە بەرهەڵستکاران دەدرێ خۆپیشاندان دژ بە رژێمەکەیان سازکەن؟ ئەگەرنا، لەو کاتانەدا چی روودەدا؟

## چوارەم: مافی پەنابەرێتی:

هـەر لەکۆنـەوە کەسـانێك لـەپێناو پاراسـتنی خۆیانـدا، ناچـاربوون لـە وڵاتەکـەیان هـەڵێنو پـەنا بـۆ دەوڵـەتانی دراوسـێ یـان هـەر دەوڵـەتێکی دی بـەرن. هـەردوو جـەنگی جیهـانیو جەنگـەکانی پێـشتریش کێـشەیەکی وای هێنایە ئاراوە، لە جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤدا بەندێکی بۆ تەرخان بکرێ.

رۆژانـە خـەڵکانێك بڕیـاری جێهێـشتنی وڵاتـی خۆیـان دەدەن. هەنـدێکیان لەترسایە, ترس لە ژیانی خۆیو ماڵومناڵی. هەندێکی تریش بە ناچاری لەبـەر باری ناهەمواری کۆمەڵایەتی یان ئابووری ملی ئاوارەیی دەگرنەبەر. گرنگترین مـافی هاوبـەش لـەنێوان سـەرجەم پەنابـەران و خوازیـارانی پەنابـەرێتیو کۆچبەرانو کۆچپێکەرانی زۆرەملێـی نـاوخۆ، مـافی یەکسانیو بـە یەکـچاو سەیرکردنیانە.

پەنابەران لە ئاکامی کەمتەرخەمی و خۆدزینەوەی حکومەتەکانیانـەوە لـە پارێزگاریکردنی مافە مرۆییەکانیان هەڵدێن. هەنـدێك لـەو حکومەتانـە خۆیـان پێـشێلکارییەکان دەکـەن، هەنـدێکی تریـشیان توانـای بەرەنگاربوونـەوەی رووداوی پێشێلکارییەکانیان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتو راگەیاندنـەکان لەچەند لایەکی ئـەم دونیایـەدا، پەنابـەران وەك گرفـتو بگـرە "تیرۆریـست" نیـشاندەدەنو هەنـدێکی دیکەشـیان بـە هـەڵاتووی دەسـتی تـیرۆر، یـان پێشێلکارییە ناهەموارەکانی مافی مرۆڤیان دەزانن.

تـا ئێـستا زیـاتر لـە١٤٠ حکومـەت، رێکەوتننامـەی سـاڵی (١٩٥١)ی نەتەوەیـەکگرتووەکانی تایبـەت بـە بـاری پەنابـەر کـە بـە "رێکەوتننامـەی پەنابەرێتی" ناودەبرێ، واژۆ کـردووە. ئـەم رێکەوتننامەیـە پێناسـەیەکی بـۆ پەنابـەر دانـاوەو هـەموان لەسـەری کـۆکن. ئـەویش "پەنابـەر کەسـێکە لـەدەرەوەی وڵاتەکـەی خۆیـدا دەژیو بـەهۆی پێناسـە یـان بیروڕاکەیـەوە، لـەوڵاتی خۆیـدا بەڕاسـتی تووشـی پێـشێلکارییەکی زۆری مافـەکانی دەبـێ.

ناتوانێ بۆ وڵاتەکەی خۆی بگەڕێتەوە، چونکە دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەی ناتوانێ یان نایەوێ پارێزگاری لێبکات".

پەنابەر لە گێڕانەوەیدا بۆ وڵاتەکەی، ڕەنگە ڕووبەڕووی چەوسانەوە ببێتەوە، بۆیە نابێ پەنابەر بە زۆر بۆ وڵاتەکەی خۆی بگێڕدرێتەوە، ئەوە مافێکی سەرەکی خۆیەتی. تەنانەت گەر کەسێکیش مافی پەنابەرێتیی نەدرابێتێ ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ قایل نابن بە زۆر بگێڕێنرێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، چونکە ڕەنگە مەترسی زینداکردن و ئەشکەنجەدان و لەسێدارەدان یان سەرەونگومکردنی هەبێ.

پەنابەریش وەك هەموو مرۆڤێکی دی جگە لەوەی گشت مافە مرۆڤییەکانی هەیە، وەك پەنابەرێکیش مافی تری هەیە، لەوانە:

نابێ جیاوازیی بکرێت لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتەکەدا.

سەربەستانە پێڕەوی ئایینی خۆی بکات.

بەڵگەنامەو، پێناسەو پاسپۆرتی بپارێزرێ.

مافی کارکردنی هەبێ.

شوێنی حەوانەوەو فێرکردن و بەدەنگەوەچوونی بۆ دابینبکرێ.

بەهۆی هاتنەناوەوەی نایاساییەوە غەرامە نەکرێ.

سەربەستی هاتوچۆکردنی هەبێ.

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، بۆ دەستەبەرکردنی مافی پەنابەرێتی، پێ دادەگرن لەسەر:

ڕێ لەکەس نەگیرێ بچێتە وڵاتێکەوە داوای پەنابەرێتی بکات.

دادوەرییانە هەڵسوکەوتی دیاریکردنی پەنابەرێتییەکەیان لەگەڵدا بکرێ.

نەگێڕێن، تەنیا مەگەر تاوانێکی دیاریکراو بەرەو ڕوویان کرابێتەوە.

بتوانن پێوەندی بکەن بە خێزان و پارێزەران و کەسانێکەوە کە وەرگێڕانییان بۆبکەن، ئەو ڕێکخراوانەی کارئاسانییان بۆدەکەن، وەك "کۆمسیۆنی باڵای کاروباری پەنابەرانی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان".

مافــە بنەڕەتییــەکانی ئــابووریو کۆمەڵایــەتیو ڕۆشــنبیریی، وەك کارکردنو فێربوونو یارمەتییە کۆمەڵایەتییەکانیان پارێزراوبێ.

جاڕنامــەی جیهــانی مــافی مــرۆڤ لەبڕگــەی (١)ی بەنــدی (١٤)یــدا دەڵــێ: "هەموو کەسێك کە لە چەوسانەوە هەڵاتبێ، مافی پەنابردنەبەر یان هەوڵدان بۆ پەنابردنەبەر وڵاتێکی دیکەی هەیە." چونکە گەر کەسـێك داوای پـەنابردن بکات، ڕەنگە بە ڕاستی پەنابەربێت، بۆیە دەبێ هەموو مافەکانی پەنابـەرانی هەبێ، تەنیا مەگەر پەنابەرنەبوونی لێئاشکرابێ.

پێویـستە چارەســەرێکی هەمیـشەیی بـۆ مرۆڤــی پەنابــەر بدۆزرێتــەوە، چارەکەش ڕەنگە بە تێکەڵبوونو گونجانبوونیبێ لەگەڵ خەڵکی ئـەو وڵاتــەی پەنای بۆ بردووە، یان لەوڵاتێکی دیدا نیشتەجێبکرێ یان بە ئارەزووی خـۆی بگەڕێتــەوە بــۆ وڵاتەکــەی خــۆی. بــۆ ئەمــەی دواییــان، واتــە گەڕانــەوەی ئارەزوومەندانــە، شــەرەفمەندانەو ڕێــزی تــەواوی مافــە مرۆییــەکانی بگــیرێ، چونکە مێژوو سەلماندویێتی، نائارامی هــەر وڵاتێـك وا لــە خەڵکەکـەی دەکات جارێکی تریش سەر هەڵگرنەوە.

## کۆچبەر کێیە؟

هــەموو ئــەو کەســانەی لــەوڵاتانی خۆیــان هەڵدێنو پــەنا بــۆ وڵاتــانی دی دەبەن، هەر بەتەنیا لەترسـی چەوسـانەوەو کوشـتن نییــە، بــەڵکو خــەڵکانێك هەن بۆ باشکردنی بژێوی خۆیانو ماڵ ومنداڵیان ڕوو لەئاوارەیی دەکــەن. بــە کورتییەکەی کەسـانێکن کــە لەشـوێنێکەوە دەڕۆنــە شـوێنێکی دی. لەوانەیــە تــرس یــان برسـێتی یــان مــسۆگەرکردنی ئــارامی و ســەلامەتی خــاوخێزان ناچــاریکردبن کــۆچ بکــەن، ڕەنگــە هــەر بۆخۆشـیش وڵاتەکــەیان جێبـێڵن. لەوانەشە تێکەڵەیەك لەو هۆکارانە پاڵی پێوەنابن. بەوجۆرە کەسانە دەوتـرێ کۆچبەر.

کۆچبەریش وەك هەموو مرۆڤێکی دی مافە مرۆڤایەتییەکانی وەك، مافی ژیانو لەسەر هیچوخۆڕایی نەگرتنو ئەشکەنجەنەدانو ژیانێکی شایستە بە مرۆڤیان هەیە. چەند پێوەرێکی یاسایی نێودەوڵەتی وا هەن رێك باس لە مافی کرێکارانی کۆچبەر دەکەن، وەك رێککەوتننامەکانی رێکخراوی کارە نێودەوڵەتییەکان. لە١ی تەممووزی (٢٠٠٣)دا رێککەوتننامەی پارێزگاریکردنی سەرجەم کرێکارە کۆچبەرەکانو ئەندامانی خێزانەکانیان واژۆکرا. کە ئەوەش دانپیانانێکی گرنگە بەوەی مافی کۆچبەران دەبێ بپارێزرێ.

مەرج نییە کۆچبەر لەوڵاتێکەوە بچێت بۆ وڵاتێکی دی، بەڵکو رەنگە لەشوێنێکی وڵاتەکەیەوە بچێتە بەشێکی دی هەمان وڵات. جیاوازی نێوان پەنابەرو کۆچبەری ناوخۆ، کۆچبەری ناوخۆ لەلایەکی وڵاتەکەی خۆیەوە دەچێتە لایەکی دی، بەلاّم پەنابەر دەبێ سنووری نێودەوڵەتی وڵاتەکەی خۆی تێپەڕێنێ. زۆرجار کۆچبەر وەك پەنابەر، لەدەست شەڕوشۆڕ یان پاکتاوکردنی ڕەگەز یان چەوسانەوە ئاینییەکان یان برسێتی، هەڵدێ.

خەمڵاندنەکانی ساڵی (٢٠٠٣) بوونی (١٧٥) ملیۆن کۆچبەر لەدنیادا ڕادەگەیەنێ، ئەویش لە (٢,٨٪)ی دانیشتوانی دنیایە کە ئێستا بە (٦,٣) ملیار مرۆڤ مەزەنە دەکرێ. نزیکەی (١٠,٤) ملیۆن پەنابەریش لەدنیادا هەیە، واتە خۆی لە (٠,١٧٪)ی دانیشتوانی دنیا دەدا. ئێستا ژمارەی کۆچبەرە ناوخۆییەکانیش خۆی لە (٢٥,٨) ملیۆن کەس دەدا، واتە لە (٠,٤٪) دانیشتوانی دنیایە.

زۆربەی پەنابەرانو کۆچبەرە ناوخۆکان لەهەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەفەریقادان کە هەردووکیان پێکەوە (٩,٢) ملیۆن پەنابەرو (١٨,١) ملیۆن کۆچبەری ناوخۆیان لەخۆگرتووە.

## راهێنان

- مافی پەنابەرێتی چییە؟
- پەنابەر کێیە؟
- چەند جۆر پەنابەر هەیە؟
- ئێستا پەنابەرێتی بۆتە گرفتی دونیا یان نا؟
- کەسی پەنابەرت هەیە؟
- ئەگەر هەتە هۆی پەنابەرێتییەکەی دەزانی؟
- لەوانەی دەیانناسی هەموو لە ترسی گیانی خۆیان هەڵاتوون یان هۆکاری دی هەیە بۆ هەڵاتنیان؟
- بڵێی هەر کەسانی سیاسی لە ترسی گیانی خۆیان هەڵبێن؟
- ئایا گەیشتوویتەتە بارێکی وا بیر لەپەنابەرێتی بکەیتەوە؟
- هەموو ئەوانەی وڵاتەکانیان جێدێڵن، بە پەنابەر دادەنرێن؟
- ئەگەرنا، چ جۆرە وڵات بەجێهێشتنی دی هەیە؟
- ئەگەر بارێکی ناهەموار لەوڵاتێکدا بێتەئاراوە، یەکێك وەك هەموو دانیشتوانی وڵاتەکە، ناهەمواریتی وڵاتەکەی پاڵی پێوەنابێ هەڵبێ، جۆری پەنابەری کەسێکی وا چییە؟
- مەرجە کۆچبەر لەوڵاتێکەوە بچێتە وڵاتێکی دی؟

## پێنجەم: مافی وەدەستهێنانی پلەوپایە:

هەموو کەسێك، بەپێی یاساو ڕێسای وڵاتەکەیو تواناو لێهاتوێتی خۆی بۆ وەرگرتنی پلەوپایە، مافی کێبەرکێکردنی هەیەو نابێ" ڕەگەز، تۆخم، نەتەوە، ئایین، زمان، ڕەنگ یان بیروڕا، لە وەرگرتنی پلەوپایە ڕاگەیەنراوەکاندا ڕێگربن. مرۆڤ لە هەر شوێنێكو بە هەر زمانێكو لە هەر نەتەوەیەكو هەر ڕەنگێکی هەبێو خاوەنی هەر بیروڕایەکبێ، وەك مرۆڤ مافی وەرگرتنی کاری گونجاوو شیاو بە خۆیی دەبێ، زیاتر ئەوەش لەسیستمێکی دیموکراسیدا پەیڕەو دەکرێ. لە وڵاتێکدا بۆ هەر پۆستێکی دیاریکراو کەسانێك لەسەر بنەمای هەر پێوەرێك دابنرێ، جگە لەهاوڵاتی بوونو ئەو مەرجە یاساییانەی پێویستە لەکەسەکەدا هەبن، پێشێلکردنێکی دیارو ئاشکرای مافی مرۆڤە، چونکە نایەکسانی دێنێتە کایەوە.. ناکرێو نابێ پلەوپایە وەرگرتن بە بیروڕاو پێوەندی کەسانێکەوە بەندبێ کە خاوەن دەسەڵاتبن، چونکە ئەگەر وابێ ئەوا لە لایەك جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکاندا دەکرێو لەلایەکی تریشەوە هاندانی خەڵکییە بۆ چوونە ناو حیزبو ڕێکخراوەکانی دەسەڵاتدارانەوە، کە ئەوەش پێشێلکارییەکی بەندی (٢٠)ی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤە: "١ـ هەموو کەسێك مافی ئازادیو بەشداربوونی کۆمەڵەو دەستەو تاقمە ئاشتیخوازەکانی هەیە. ٢ـ نابێ هیچ کەسێك ناچاری چوونە ریزی هیچ کۆمەڵەیەك بکرێت".

چەند بەندێکی تری جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ بایەخی بەم لایەنە داوە" "هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی مافی مووچەی چوونیەکی لەکاری چوون یەکدا هەیە" ئەمەشیان بڕگەی دووەمی بەندی (٢٣)یە، بڕگەی یەکەمی بەندی (٢١)یش دەڵێ "هەموو کەسێك چوونیەك مافی وەرگرتنی کارو فەرمانبەرییە گشتییەکانی لەوڵاتەکەیدا هەیە." کەئەویش هەمان مەبەست دەگرێتەوە... بە شێوەیەکی گشتی، ناکرێ پلەوپایە، لەبەر هەر جۆرە پێوەندییەکی کەسەکە بە دەسەڵاتەوە، لەچەند کەسێکی دیاریکراودا پاوان بکرێت.

## راهێنان

ــ ئایا كارامەیی بە مەرجێكی سەرەكی كێبەركێكردنی وەرگرتنی پۆستێكی دیاریكراو دادەنرێ؟

ـ "هەموو كەسێك مافی كاركردنو ئازادی هەڵبژاردنی كاری لەسایەی مەرجگەلێكی رەواو ماقوڵدا هەیە، هەروەها مافی پاراستنی لە بێكاری هەیە." ئەوە دەقی برگەی یەكەمی بەندی (٢٤)ی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤە. ئەو دەقە مافی وەدەستهێنانی پلەوپایە دەگرێتەوە؟ روونیبكەرەوە.

## شەشەم: مافی گەلان لە دیاریكردنی چارەنوسو مافی كەمە نەتەوەكان:

دوای دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوە[1]، كێشەی كەمینە بە رێكەوت یان بە زۆرە ملە، بە دەوڵەتێكی دیاریكراوەوە لكێندرابێ، سەری هەڵدا. جیاوازیكردن لەنێوان مرۆڤەكانی یەك دەوڵەتدا، هەستی نایەكسانی لای كەمینە دێنێتە كایەوەو وای لێدەكات، جگە لەمرۆڤێتییەكەی بیر لە رەچەڵەكی خۆیو هۆكاری جیاكارییەكەی بكاتەوەو بەو زۆرو ستەمو چەوساندنەوەیە قایل نەبێ كە لێیدەكرێ... بۆیە دوای جەنگی جیهانیی دووەم، هەوڵی چاك بۆ چارەسەركردنی كێشەی كەمایەتییەكان دراو، كارێكیش كرا، لەچوارچێوەی دەوڵەتێكدا بەناوی سەروەریی دەوڵەتەكەوە ئەو كێشەیە پشتگوێ نەخرێ.. كەچی هێشتا داپلۆسینو سەركوتكردنی هەندێكیان بە كێشەیەكی ناوخۆیی لەقەڵەمدەدرێو نایانەوێ هیچ لایەنێك خۆی لەكاری ناهەمواری دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەرەكان هەڵقورتێنێ. چەوساندنەوەی ئەو كەمینانە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، ململانێیەكی خوێناوی خستەوە. هەر ئەوەش وایكرد بایەخ بە مافی چارەنووسی گەلان بدرێ.

---

[1] دەوڵەتی نەتەوە: پاش رووخانی رژێمی دەرەبەگایەتیو شكستهێنانی دەسەڵاتی كەنیسە, چەندین دەوڵەت لە ئەوروپا لەسەر بنەمای نەتەوایەتی دروست بوو لەسەر بنەمای نەتەوایەتی, وەك: نەمسا, ئیتاڵیا, فەرەنسا, ئەم جۆرە لە دەوڵەت تا ئەمرۆ درێژەی هەیە.

مەبەست لە مافی چارەنوس رەخساندنی زەمینەی ئازادیی گەلە بۆ پێکهاتنی قەوارەیەکی سیاسیو یاساییو ئابورییو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریی و کلتوریی، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، یان لە ناو دەوڵەتێکی دیاریکراودا بێت..

چەندین ڕاگەیاندن لەو ڕووەوە دەرچوو" لەوانە راگەیاندنی ویڵسن, دوای جەنگی جیهانیی یەکەم، ئەڵمانیا بەمەرج خۆی بەدەستەوەدا، لە (١٩١٨/١١/٥)دا ویلسن پەیمانی دا، ویلاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بە پیشنیازەکانی ئەڵمانیا قایلبن. بڕیاربوو بنەمای کارەکە چواردە خاڵەکەی ویلسن بێت. لە وتارە چوار بەشە سەرەکییەکەی ولسنی ساڵی ١٩١٨ دەڵێت:

"نابێ هیچ جۆرە بەشدارییەك هەبێت. هیچ زیانێك بە هۆی سزادانەوە هەبێت. نابێ خەڵکی لەرێی کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتییەوە لە دەسەڵاتێکەوە بدرێنە دەسەلأتێکی دی . دەبێ رێز لە ویستە نیشتیمانییەکان بگیرێت، دەبێ گەلان قایلبن بەو دەسەڵاتەی بەسەریاندا دەسەپێنرێت. چونکە – مافی چارەنووس– زاراوەیەکی بێ واتا نییە".

راگەیاندنی ئەتڵەسی "رۆزفلت"[1]ی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو سەرەك وەزیرانی بەریتانیا وینستۆن چەرچڵ، ساڵی (١٩٤١) بڕیارێکی هاوبەشیان دەرکرد کە تێیدا ئەو پرنسیپانەیان ئاشکرا کرد کە ئەم دوو دەوڵەتە لەدوای روخانی رژێمی نازی لە ئەڵمانیا بۆ بەدیهێنانی جیهانێکی ئاشتیخوازو کۆمەڵایەتی بڕیاربوو پراکتیزە بکرێت. ئەم پرەنسیپانەش بریتی بوون لە:

---

(١) رۆزفلت: (١٨٨٢– ١٩٤٥) سەرۆکی سیودووەمینی ئەمەریکایە لە(١٩٣٣– ١٩٤٥). رۆڵێکی گرنگی لەجەنگی دووەمی جیهانیدا بینی.

١) چوار ئازادی بنچینەیی: ئازادبوون لە برسێتی، لە ترس، ئازادی رادەربڕینو ئازادی ئایین.

٢) بەدیهێنانی ماف چارەنووس لەگشت مەسەلە سەرەکیەکانیدا

٣) ماف گشت گەلان بۆ هەڵبژاردنی جۆری ئەو حکومەتەی کە ئەوان بۆ داڕشتنی شێوەی ژیانیان پێویستیان پێیەتی.

٤) ئازادیی بازرگانی و پێکەوە کارکردنی ئابووریی لە نێوان سەرجەم نەتەوەکاندا

٥) ئاشتی و سەلامەتی بۆ گشت دەوڵەتان

٦) ئازادی هاتوچۆی پاپۆڕ لە دەریاکاندا

٧) وازهێنان لە بەکارهێنانی چەك و دامەزراندنی سیستمی ئارامی و سەلامەتی هەمیشەو رامالینی چەك لەو نەتەوانەی کە ئاشتی دەخەنە مەترسییەوە. بۆ هەمان مەبەست (ویلسن)یش لە جەنگی یەکەمی جیهانی (١٤) خاڵی خستە روو. بەڵام هیچ هێزێکی سەربازیانە و یاساییانە لە پشتیەوە نەبوو بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانە.

دوای دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، رێکخراوەکە بۆ بەدیهێنانی چارەنووسیان، رەوایی بەخەباتی گەلان دا، کەچی زلهێزەکانی دونیا بیانووی جۆراوجۆریان بۆ کۆسپ خستنە رێی وەرگرتنی ئەو مافەو سەرکوتکردنو نەهێشتنی شۆڕشە ئازادییخوازەکان دەهێنایەوە.

بۆ چارەسەری کێشەی گەلانو کەمە نەتەوەکانیش رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان چەندین بڕیاری دەرکرد، وەك بڕیارەکانی (١٨٠٣)ی کۆمەڵەی گشتی، کە لە (١٩٦٢/١٢/١٤) دەرچوو، تایبەتبوو بە مافی وڵاتان بۆ کەڵکوەرگرتن لە سامانە سروشتییەکان، بڕیاری (١٥١٤)ی کۆمەڵەی گشتی ساڵی (١٩٦٠)ی تایبەت بە سەربەخۆیدانی گەلانو وڵاتانی ژێر دەستە کە بە بڕیاری (لەناوبردنی ئیستیعمار) ناسراوە. تێیدا مافی چارەنوسی گەلان بە جۆرێك کە دیاریکراوە، ئازادانە بتوانن پێگەیەکی پتەوی سیاسیانە دروست بکەنو گەشە بە ئابورییان بدەنو ماف کۆمەڵایەتیور ۆشنبیریی دەستەبەر

بکەن، بڕیاری (٢٩٥٥)ی کۆمەڵەی گشتی لەساڵی (١٩٧٢) تایبەت بە ڕەوادان بە خەباتی چەکدارانەی گەلان بۆ بەدەستهێنانی مافی چارەنوس).

ئـــەم بڕیارانـــە سیاســـەتی داگیرکـــردن بـــە هـــەموو شـــێوەکانییەوە قەدەغـــەکردووەو خـــستوونیەتە خانـــەی تاوانـــەوەو ڕەواییـــشی بـــە خـــەباتی هێنانەدی مافی چارەنووس داوە ":

١ـ هەموو گەلێك مافی دیاریکردنی چارەنووسی خـۆی هەیـەو بـەپێی ئـەو مافە بۆی هەیە بە ئـازادی بڕیـار لەسـەر قـەوارەی سیاسـیانەی خـۆی بـداتو ئازادانە درێژە بە گەشەکردنی ئابووریی کۆمەڵایەتیو ڕووناکبیریی بدات.

٢ـ هەموو گەلێك بۆهێنانەدی ئامانجە تایبەتییەکانی، دەتوانێ بە ئازادی ڕەفتار لەگەڵ سامانو داهاتە سرووشتییەکانی خۆیدا بکات، بێئەوەی لە هیچ پابەندییەك لابدات کە لە هاوکاریی ئابووریی دەوڵەتان پەیدا دەبێـتو لەسـەر بنەماکانی سوودی هاوبەش دامەزراوەو نابێ بەهیچ شێوەیەك هیچ گـەلێك لـە هۆ تایبەتییەکانی ژیانی بێبەش بکرێت." ئەوە دەقی بەندی یەکەمی، بەڵێنی نێودەوڵەتی تایبەتی مافە مەدەنیو سیاسییەکانە، کە بە بڕیارێکی کۆمەڵـەی گشتی، متمانەی پێدراوە...

لەوانـەی سـەرەوەوە لامـان ئاشـکرا دەبێـت کـە بەدەسـتهێنانی مـافی چارەنووس ڕەوایەو ناکرێ بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی دابنرێو لە چوارچێوەی سـەروەریی دەوڵەتێکـدا سـەیربکرێ، بـەڵکو مەسـەلەیەکی نێودەوڵەتییـەو لەکۆنگرەی دەوڵەتە بێلایەنەکانی ساڵی ١٩٦٤دا، کـە لـەقاهیرەی پایتـەختی میـسر بەسـترا، دان بـە ڕەوایـەتیی تێکۆشـانی گـەلانی بندەسـتدا نـراوەو نوێنەرانی بزووتنەوەکانیش بە نوێنەرانی گەلەکانیان دادەنران. لە کـۆنگرەی جەزائیری ساڵی (١٩٧٣)یشدا بە هەمان شێوە ئـەم کـارە دووبـارە کرایـەوە. هەر لەو ساڵەدا، کۆمەڵەی گـشتی نەتـەوەیـەکگرتووەکان بـە بڕیـاری (٣٠١٢) ڕەوایی هەوڵو تێکۆشانی گەلانی ڕاگەیاند کـە دژی داگیرکـەران و دەسـەڵاتی بێگانەو ڕژێمە ڕەگەزپەرستەکان دەیانکرد..

## راهێنان

ـ ئایا ئەو کۆنگرەو بڕیارانەی سەبارەت بە مافی چارەنووس دەرچوون، بە کردەوە هیچ کاریگەرییەکیان هەبوو؟

ـــ ئایا چارەنووسی گەلان لەکام خانەی مافەکانی مرۆڤدا خۆی دەبینێتەوە؟

ـ ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان مافی کەمە نەتەوەکانو مافی گەلان؟

## تەوەرەی دووەم

## مافە ئابووریی و رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتییەکان :

بەوە دەناسرێنەوە کە تەنیا بە یاسا دەستەبەر ناکرێن, بەڵکو پێویستیان بە بارێکی ئابووریی گونجاو هەیە ئەرکی دەوڵەتو دامەزراوەکانیەتی دەستەبەری بکاتو یەکێك لە خەسڵەتەکانیشیان بە تایبەتی مافە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان ئەوەن کە مافی (پێدانن)و ئەو کۆمەڵە مافانەن کە شێوەیەکی گشتییان هەیەو راستەوخۆ بە ژیانو گوزەرانو گەشەکردنی مرۆڤەوە گرێدراونو لە ئاستی جیهانیشدا گرنگی تایبەتیان پێدراوە لە رێگەی بەستنی کۆنگرەکانی گەشەپێدانی مرۆڤو بەستنی پەیماننامەو رێکەوتننامەکان کە گرنگترینیان پەیماننامەی مافە ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیرییەکانی ساڵی (١٩٦٦)ی پەسەندکراوە لەلایەن رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کە دەبێت بۆسەرجەم مرۆڤەکان بەبێ جیاوازیی زمان, رەگەز, بنەچەی نەتەوەیی, بیروباوەڕ, ئایین, دەستەبەر بکرێن کە ئامانج لێیان خۆشگوزەرانی گشتییە لە کۆمەڵێکی دیموکراتی.

## گرنگترین مافەکان بریتین لە :

١- داننان بە مافی کارکردن لە رێگەی رەخساندنی زەمینەی کارکردن کە مرۆڤ خۆی ئازادانە هەڵیدەبژێرێت، ئەرکی دەوڵەت دەستەبەرکردنی بەرنامەی مەشق پێکردنو ئاراستەکردنو دابین کردنی ئامرازە تەکنیکیو پیشەییەکانو دارشتنی سیاسەتی گونجاو کە گەشەپێدانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیریی لێ بکەوێتەوە .

٢- دابین کردنی مەرجەکانی دادپەروەریی بۆ کار وەك کرێی گونجاو، مەرجی کارکردن بۆ پاراستنی گیانو تەندروستی, هەلی کارکردن, پشوو کاتی کار.

٣- مافی پێکهاتن‌و بوونە ئەندام لە سەندیکاو ڕێکخراوەکان بە شێوەیەك، ببێتە پاڵنەرێکی بەهێز بۆ دەستەبەرکردن‌و پاراستنی بەرژەوەندییە ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ڕۆشنبیرییەکان .

٤- پێویستی پاراستن‌و یارمەتیدانی خێزان بەو پێوەرەی کە یەکەیەکی کۆمەڵایەتییەو بنەڕەتی کۆمەڵە لە هەموو لایەکەوە، لەوانە ئاستی گوزەرانی گونجاو, دابینکردنی خۆپاراستنەکان بۆ دایك, دابینکردنی خواردن‌و پۆشاك ... هتد.

٥- دابین کردنی پاراستن‌و چاودێری پزیشکی, کەمکردنەوەی ڕێژەی مردنی کۆرپە, چاکردنی باری تەندروستی‌و خۆپاراستن لە نەخۆشییەکان, ڕێگرتن لە بڵاوبونەوەیان .

٦- مافی تاك بۆ پەروەردەو فێربوون .

٧- مافی تاك بۆ بەشداری لەژیانی ڕۆشنبیریی‌و سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی زانست‌و پاراستنی شاکارە ئەدەبی‌و زانستی‌و هونەریی‌و داهێنانەکان‌و بەرژەوەندییە ماددی‌و مەعنەوییەکانی.

٨- ئازادی موڵکداری بۆ مرۆڤو بەکارهێنانی بە شێوەیەکی وا کە لە یاساو دەستوورەکاندا دیارییبکرێت.

ئەم مافانەی خوارەوە چەند مافێکی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرین:

### ١- بیمەی کۆمەڵایەتی‌و ژیانی گونجاو:

بیمەی کۆمەڵایەتی، یارمەتییەکە یان مووچەیەکی مانگانەیە، بۆ کەسانێك دەبڕدرێتەوە، کە لەبەر هەر هۆیەکبێ کاریان پێناکرێ‌و توانای پەیداکردنی بژێوی خۆیان‌و ماڵ ومنداڵیان نییە..

ئاستی باشی گوزەران‌و مافی هەبوونی بیمەی کۆمەڵایەتی، هەر ڕێکەوتننامەی تایبەت بە مافە ئابووریی‌و ڕۆشنبیریی‌و کۆمەڵایەتییەکان چارەسەری نەکردوە، بەڵکو بەندی (٢٢)ی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤیش

لەو رووەوە دەڵێ:"هەموو کەسێکی ئەندامی کۆمەڵ مافی بیمەی کۆمەڵایەتی هەیە، کە لە رێگەی داهاتی میللیو هەرەوەزیی نێونەتەوەییو بەگوێرەی یاساو دەستوور، داهاتی هەر دەوڵەتێك دەبێ مافی ئابووریيو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی کە پێویستن بۆ نێوو ئابروو گەشەکردنی ئازادانەی کەسێتی، دابین بکرێن." بەندی (٢٥)ی جاڕنامەکە دەڵێ: "١ـ هەموو کەسێك مافی ژیانێکی گونجاوی هەیە کە بەشی پاراستنی لەشساغیو خۆشگوزەرانی خۆیو خێزانی بکات، ئەوەش خۆراكو پۆشاكو خانوو و چاودێری پزیشکیو خزمەتە کۆمەڵایەتییە پێویستیەکانیش دەگرێتەوە. دیسان مافی بیمەکردنی ژیانی لەکاتی بێکاریو لە نەخۆشیو پەککەوتەییو بێوە (ژنیو پیاوی)و پیریو لەدەستدانی ئامرازی ژیان بە هۆی هەلومەرجی دەرەکیی بەدەرن لەدەستەڵاتی مرۆڤ. ٢ــ دایکانو منالان مافی یارمەتیو چاودێرییەکی تایبەتییان هەیەو هەموو منداڵانیش ئەگەر بە رێگەی شەرعی یان ناشەرعیی لەدایك بووبن دەبێ هەمان پارێزگاریی کۆمەڵایەتییان هەبێت.". بە پێی ئەو دوو بەندەی سەرەوە، پێویستە هەر کەسێك لەبەر هەر هۆیەك توانای کاری نەبێت، لەرێی بیمەی کۆمەڵایەتییەوە ژیانی بە رادەیەکی وا مسۆگەر بکرێ کە لەرێزی کەم نەکاتەوە.

بیمەی کۆمەڵایەتیو ژیانی گونجاو یەکێکە لە مافە ئابووریيو کۆمەڵایەتییەکان، کە وەچەی دووەمی مافی مرۆڤی پێدەوترێ لەمافە سەرەکییەکانی مرۆڤەو لێی جیاناکرێتەوە. بە زۆری بە واتای یاسایی وشەکە بە مافی کۆمەڵ دادەنرێ نەك تاك. مافە ئابووریيو کۆمەڵایەتییەکان بەپێی سروشت, مانا یاساییەکەی, پابەند بوون, داواکردنی, لەمافە مەدەنیو سیاسییەکان جیادەکرێنەوە، ئەوانەش:

یەکەم: کۆمەڵە مافێکن یەکسەر بە ئەنجام ناگەیەنرێن، بەڵکو بەرەبەرە, چونکە جێبەجێکردنی تەواوەتییان پێویستی بە بەکارهێنانی داهاتێکی زۆری

بەردەست هەیە، جا داهاتەکە هی ناوخۆبێ یان دەوڵەتیبێ، بەوپێیەش بەئاکام گەیاندنی هەنگاوی بەرو دوای گەرەکە.

دووەم: مافی ئابووریو کۆمەڵایەتی بەشدارییەکی چاکو کاریگەری دەوڵەتی پێویستە، خۆ ئەگەر بۆ بەدیهێنانی مافی مەدەنیو سیاسی، بە زۆری پێویستی بەوەبێ دەوڵەت شتێك نەکات، بۆ نموونە وەك ئەشکەنجەنەدان، جگە لە وازهێنانی دەوڵەت لێی شتێکی دی ناوێ. بەڵام بۆ نموونە مافی پەروەردەو خوێندن، پێویستی بەهەوڵو داهاتێکی زۆر هەیە، کە زۆر لەسەر دەوڵەت دەکەوێ تاجێبەجێ بکرێ. بەگەڕخستنو بەدیهێنانی مافە ئابووریو سیاسییەکانیش، دەبێ راستەوخۆ سەرمایەو داهاتی تەواوی بۆ دابینبکرێ..

بەپێی ئەو دوو بەندەی سەرەوەی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ پێویستە لە هەر وڵاتێکداو بە گوێرەی باری داراییو چۆنێتی ژیانی هاوڵاتیان، ژیانێکی گونجاو بۆ هەر یەك لە هاوڵاتیانی خۆی بێنێتە کایەوە، جا با ئەو هاوڵاتییە توانای خزمەتیشی نەبێ. دەکرێ دەسەڵاتدارانی وڵاتەکە، بەپێی داهاتی وڵاتەکە، جۆرو رێژەی بیمەکە دیاریبکەن، چ لە رێی داهاتە سروشتییەکانی وڵاتەکەوە بێ یان وەرگرتنی باج یان هەر شێوەیەکی دی کە بە پەسەند بزانرێ.

## راهێنان

ـ مەبەست لەبیمەی کۆمەڵایەتی چییە؟

ـ بەروبوومی وڵات بۆ کێیە؟

ـ دەکرێ کەس لەو بەروبوومە بێبەشکرێ؟

ـ مەبەست لەژیانی گونجاو چییە؟

– بیمەی کۆمەڵایەتی جگە لەدابینکردنی خواردنو جلوبەرگ چیتر دەگەیەنێ؟

– بیمەی کۆمەڵایەتی هەر بۆ پیرو پەککەوتەیە یان خەڵکی تریش دەگرێتەوە؟ ئەگەر گرتییەوە کامانەن؟

– منداڵی ناشەرعی بیمەی کۆمەڵایەتیو چاودێریی کۆمەڵایەتی دەیگرێتەوە؟

## گرنگییەکانی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ لەناوخۆ:

دەوڵـەت وەك پێکهاتـەو خـاوەن کەسـایەتییەکی مەعنـەوی دەسـەلاَتێکی گـشتی بەسـەر هاوولاَتیانیـدا فەراهـەم دەکـات، کـە بـە دەسـەلاَتی گـشتی دەناسرێت، بـەپێی ئایدۆلۆژیاو فیکرو رِێبـازی سیاسـی بەرِێوەدەچێت، کـە ئەمەش لە ولاَتێکەوە بۆ ولاَتێکی دی دەگۆرِێت لێرەوە مافی مرۆڤ دەکەوێتـە ژێر کاریگەریی ئەو گۆرِانە بە جۆرێك کە لە ولاَتێکی دیکتـاتۆرییەو دەسـەلاَتی تاك رەویدا مافەکانی مرۆڤ بـە فـراوانترین شـێوە پێـشێل دەکـرێن، بـەلاَم لـە ولاَتو رِژێمی سیاسی دیموکراسیو لە سایەی دەوڵەتی یاسادا مافەکانی مرۆڤ دەچەسـپێت یـاخود لـە کـاتی پێـشێلکارییەکاندا ئەنجامـدەرانی رووبـەرِووی بەرپرسیاریەتی یاسایی دەکرێنەوە. گەر دەسـەلاَتی گـشتیش ووردبکرێتـەوە لە سێ دەسەلاَتی سەرەکی پێکدێت (یاسـادانان, جێبـەجێکردن, دادوەریـی) هەریـەك لەوانـە راسـتەوخۆ یـان نارِاسـتەوخۆ بـە بنـەماکانی مـافی مرۆڤـەوە گرێدراون، بەو پێوەرەی مافی مرۆڤ پەیوەندی توندو تۆلَی لەگەلّ دەسـەلاَتی یاساداناندا (پەرلەمان) هەیە، چـونکە ئـەو دەسـەلاَتە توانـای دەرکـردن یـان چاککردن یان هەلّوەشاندنەوەی یاسای هەیە بۆیە دەتوانێت بە شێوەیەك لەو شێوانە، یاساکان ئاوێتەی بنەماکانی مافی مرۆڤ بکات. هەر بۆیـە لـە زۆربـەی پەیماننامەو رێکەوتننامەکانی بواری مافی مرۆڤـدا، بەنـدێکی تایبـەتی هەیـە، باس لە چاکسازی یاسـاکانو گونجانـدنیان لەگـەلّ بنـەماکانی مـافی مرۆڤـدا دەکات، چونکە مافی مرۆڤو یاساکان دوو یەکەی پێکەوە گرێدراون.

هەر لەو چوارچێوەیەدا، زۆرترین رووبەرِووبوونەوە لە نێـوان مـافی مـرۆڤو دەسـەلاَتی جێبەجێکردنـدا رِەنـگ دەداتـەوە، ئـەو دەسـەلاَتە لـە رێگـەی دامودەزگـا جیاوازەکانـەوە یاسـاو دەسـەلاَتی گـشتی بەسـەر هاوولاَتیانـدا دەسـەپێنێت، بۆیـە لـە سـایەی نـەبوونی چـەندین پێـوەرو چـاودێریی, سنووردانەنان بـۆ ئـەم دەسـەلاَتە زەمینـەی پێشێلکاری بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ دەرِەخـسێت، کـە ئـەویش لـە دوو بـواری سـەرەکیدا دەگیرسـێتەوە (تـاك

بەرامبەر تاك)و (دەسەلاتی گشتی بەرامبەر تاك)، بەو پێوەرەی کە بنەماکانی مافی مرۆڤ یاساین، لەکاتی پێشێلکردندا لە هەر دوو بارەکەدا دەبێت دادگاکان و دەسەلاتی دادوەریی ئەرکی پاراستن‌و گێڕانەوەی ماف لە ئەستۆ بگرن، کاتێك ( تاك ) دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی تاکێکی تر، لە یاسا لادەدات، کە دەسەلاتی گشتیش مافی مرۆڤ بەتاك یان بەکۆ پێشێل دەکات زیادەڕۆیی لە دەسەلاتەکانیدا دەکات‌و بە هەمان شێوە لە یاسا لادەدات.

مافەکانی مرۆڤ, یاسا پاراستنی دادوەرییان بۆدابین دەکات، بۆیە دەبێت دەسەلاتی دادوەریی سەربەخۆ بێت سەروەری یاسا بپارێزێت‌و مافی پەنابردنە بەر دادگاکان بۆ هەموو مرۆڤێك پارێزراوبێت، بەبێ جیاوازیکردن لە نێوانیاندا، جا جیاوازیکردنەکە لەبەر هەر هۆکارێك بێ، وەك لە پەیماننامەی مافە مەدەنی‌و سیاسیەکانی ساڵی ١٩٦٦ داهاتووە (هەموو مرۆڤ، بەرامبەر دادگا یەکسانن‌و مافی هەر کەسێکە لەکاتی بوونی داوا، چ داوای سزادانبێت یان مەدەنی، دەبێت کێشەو داواکەی لەلایەن دادگایەکی تایبەتمەندی سەربەخۆوەو بەشێوەیەکی دادپەروەرانە ببینرێت).

دەکرێ مافی مرۆڤ بەو پێوەرە بنەڕەتییانە بناسێنرێ کە مرۆڤ بەبێ بوونیان شکۆدارانە ناژی. مرۆڤایەتی بناغەی ئازادی‌و دادوەریی‌و ئاشتییە، رێزگرتنی مافی مرۆڤیش رێخۆشکەرە بۆ پەرەپێدانی تەواوی کەسایەتی تاك‌و کۆ.

رەگوریشەی مافی مرۆڤ، لەو خەباتە نەپساوەی مرۆڤایەتییەوە هاتووە، کە لە سەرتاسەری دونیادا، بۆ ئازادی‌و یەکسانی کراوە. لەو هەوڵو کۆششەی مرۆڤایەتیشەوەیە کە لە سەرچاوە جۆربەجۆرو فەلسەفەو ئایینە جیاوازەکانەوە بۆی ماوەتەوە. ئەو مافانەش لە چەندین بەڵێننامەی نێودەوڵەتی مافی مرۆڤەوە ریزبەندکراون، کە گرنگترینیان جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤە.

پاراستنی مافی مرۆڤ، یەکێکە لە بنچینە بنەڕەتییەکانی ئارامیی ناوخۆ، ئەویش بە بڕوابوونی تەواو بە بنەماسەرەکییەکانی.. لە هەرکوێ مافی مرۆڤ بە راستیی پارێزراوبێ، ئەوا ئەو شوێنە ئارامو روو لەگەشەکردن دەبێ. هەر کەسەو هەڵسوکەوتی خۆی لە قەوارەیەکی دیاریکراودا دەزانێو لێیدەرناچێ. کەس بە هۆی " ڕەنگ، ئایین، نەتەوە، رەگەز، بیروڕا یان هەر شتێکی دی جیاناکرێتەوەو هەست بە کەموکورتی ناکاتو بەڕێزیشەوە لەمرۆڤەکانی دی دەڕوانێت، ئەوەش هاندەرێکە بۆ بەجێهێنانی ئەرکە مرۆییەکانی ناو کۆمەڵ. بە پێچەوانەوە، لەو شوێنانەی مافی مرۆڤیان تیادا پشتگوێ دەخرێو لەبەر هەرهۆیەکبێ جیاکاری هەبێ، ئەوا" نائارامی، راڕایی، ترسوتۆقین، خەڵکەکەی دەگرێتەوەو هەمیشە ڕوو لە دواکەوتنو نەهامەتی دەکاتو پێشێلی تەواوی یاساش دەکرێ. کەس ڕێز لە مافی کەسی دی ناگرێو لە جێبەجێکردنی ئەرکیشدا کەمتەرخەمی زاڵدەبێ. بەوەش پشێوییەکی تەواوی تیادا دەکەوێتەوە. ژمارەیەکی بەرچاو لە دەوڵەتان لە یاساو دەستوورەکانی خۆیدا بایەخێکی تەواوی بەو (٣٠) بەندەی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ داوە، کە دوای جەنگی دووەمی جیهانیی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕایگەیاند، ئەو جەنگەی کە نزیکەی شەست ملیۆن کەس تیایدا گیانی لەدەستداو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا زیانی گەورەیان لێکەوتو وێرانکران. هەر ئەو زیانە زۆرەش وای لە ئەوروپا کرد، لە قۆناغەکانی دوای جەنگ بەشێوەیەکی باشتر خۆی بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤەوە ببەستێتەوەو بیپارێزێ.

لە ئەوروپادا، بەتایبەتی لە ئەوروپای خۆرئاوا، بە دەیان ڕێکخراو بۆ پارێزگاریکردن لەمافی مرۆڤ دامەزرێنرانو دانیشتوانی زۆربەشیان بە دەنگ بانگەوازەکانیانەوە چوون..

ئەو ڕێکخراوە جیهانیانە شوێنی دیاری خۆیان گرتووەو بەیاننامەی ساڵانەیان حسابی تەواوی بۆ دەکرێت، هەر وڵاتێکیش پێشێلکاری لەو بە یاننامانەدا هەبێت ئەوا بۆ ئەوەی شێوازی خۆی لەو بارەیەوە بگۆڕێو تۆماری مافی مرۆڤی خاوێن ڕاگرێ، گوشاری تەواوی دەخرێتە سەر.

هـەر دەوڵـەتێك، شارسـتانێتیو پێـشکەوتنی بـە پارێزگـاریکردنی مـافی مرۆڤەوە بەندە، چەند مافی هاووڵاتییەکانی خـۆی راگرێ ئەوەنـدە یاسـا لـە وڵاتەکەدا سەروەر دەبێو کەم کێشە دەبێ، پێچەوانەکەشی راسـتە. چـونکە پێـشێلکردنی مـافی مـرۆڤ، نایەکـسانیو نائـارامیو بێمتمانـەیی دەخاتـەوە. پاراستنی مافی مرۆڤ هۆیەکی سەرەکییە کە بە راستیی مرۆڤ خـۆی بـە مـرۆڤ بزانـێ. جارنامـەی جیهـانی مـافی مـرۆڤ، کـە تێکـڕای هـەر ٣٠ بەندەکـەی پارێزگاریکردنـە لـە مـافی تاکەکـەس، هۆیـەکی گرنگـی پێکـەوە هەڵکردنـەو رێزگرتنــە لــە راوبۆچــوونو پیرۆزییــەکانی یــەکتری، دوورکەوتنەوەیــە لەدوژمنایەتیو پێکداهەڵپژان. هەر دەوڵەتێکیش زۆرترین بەنـدی ئـەم مافانـە بپارێزێ، دەبێتە جێگای متمانەی هاولاتیانی خۆیو دەوڵـەتانی دیو خـۆی لەڕیزی پێشەوەی ڕێزلێگیراواندا دەبینێتەوە.

## راهێنان

- دەکرێ وڵاتێك بانگەشەی پارێزگاری مـافی مـرۆڤ لێبـداو کەچـی گـرتنو ئەشکەنجەدان بە ئارەزووی بەرپرسانیبێ؟
- دەکـرێ هــەر پــارتێکی سیاســی لــەڕێی توندوتیژییــەوە دەســەڵات وەدەستبێنێو بانگەشەی پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤیش لێبدات؟
- سەپاندنی حیزبایەتی بە زۆرەملـە چـۆن هەڵدەسـەنگێنی؟ لـەو ڕووەوە وەڵامەکەت ڕوونکەرەوە.
- دەستەڵاتداران، مافی مرۆڤ دەبەخشنەوە یـان مافـەکان لـە بنەڕەتـەوە هەن؟
- لەکۆمەڵدا پێویستە هەر کەسەو فێری مافەکانی خۆی بکرێ؟
- کاتێك مافی کەسێك پێشێل دەکرێت دەبێ پەنا بۆ کام دەزگا بەرێت ؟

## تەوەری یەکەم

## گرنگی مافی مرۆڤ لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا :

لەمڕۆدا، لە سایەیی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دیکتاتۆریو کرانەوەی کۆمەڵان و بەهێزبوونی تەوژمی دیموکراسیو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بەگەڕکەوتنی چەندین ڕێکخراوی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، وەك ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ڕێکخراوی چاودێریکردنی مافی مرۆڤ لە دونیدا، فەرەنسای ئازاد، خاچی سورو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە مەدەنییەکانو دامەزراندنی ڕێکخراوە ناوچەییەکانو بەرتەسك بوونەوەی چەمکی سەروەری دەوڵەت، مافی مرۆڤ لە ئاستی نێودەوڵەتیدا ڕۆژانە لە پەرەسەندن و گەشەکردندایە.

مافی مرۆڤ بۆتە پێوەرێکی گرنگی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان. ئەو دەوڵەتانەی بەجۆرێك لەجۆرەکان مافی مرۆڤیان تیادا پێشێلدەکرێتو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیو ناوچەییەکان پێشێلکارییەکانیان دەخەنەڕوو، داوای چاککردنی ڕەوشی مافی مرۆڤیان لێدەکرێ.. وەك دەڵێن دونیای ئەمڕۆ بۆتە گوندێكو کۆمەڵە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی وا هاتوونەتە ئاراوە، تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووی ئەمڕۆیان بۆ ڕسواکردنی ئەو دەوڵەتانە خستۆتەگەڕ کە گوێ بە مرۆڤو مرۆڤایەتی نادەنو کورسیو دەستەڵاتەکەی خۆیانیان لەسەرو هەموو شتێکەوە داناوە. ئێستا، لەلایەکەوە لەڕێی گوشاری ڕێکخراوە نێودەوڵەتیو کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکانی دەوڵەتانو جەماوەری وڵاتەکان، لەلایەکیتریشەوە بە زوویی سەر ئاوکەوتن و ئاشکرابوونی ڕاستییە شاراوەکانیان ئەو دەوڵەتانە ڕسوادەکرێن.

چەوساندنەوەی گەلێك، لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەکەیەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی توندوتیژی زۆر، توندوتیژییەك هەرچی ڕێزبێ، نە بۆ بنەماکانی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ و نە بۆ هیچ کام لە بەڵێننامە نێودەوڵەتییەکان دانەنێ و بەرهەڵستکارانی خۆی بەشێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە داپڵۆسێ، ئەوا لە بارێکی وادا، پێویستە پەنا بۆ کۆمەڵەی نێودەوڵەتی ببرێو ئەویش لەڕێی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، بۆ ڕاگرتنی ئەو جۆرە ستەمە، ڕەوایی بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتاندا بدا، بە تایبەتی دژ بە ڕژێمگەلێك کە بە ڕێگەیەکی ناڕەواو سەربازییانە هاتبنو بۆ سەپاندنی خۆشیان، لە زمانی

ئازارو ئەشكەنجەدانو سەركوتكردن بەولاوە چی دی نەزانن.. هەر ئەوەش رێی بە نەتەوەیەكگرتووەكان دا، لە كۆرەوەكەی ساڵی ١٩٩١ی گەلی كورددا، بڕیاری ٦٨٨، بۆ پارێزگاریكردنی مافی مرۆڤ لە عێراق بەگشتیو كوردستان بەتایبەتی دەربكات، دەرچوونی ئەم بڕیارە بووە سەرەتای دەستتێوەردانی نەتەوە یەكگرتوەكان لە كاروباری ئەو دەوڵەتانەی كە بە شێوەیەكی بەرفراوان مافی هاوڵاتیانی خۆیان پێشێلدەكەن. ئەوە بوو لە چوارچێوەی ئەم گۆڕانەدا نەتەوەیەكگرتوەكان، بە مەبەستی راگرتنی ئەو پێشێلكارییانەی لە صۆمال و یوگسلافیاو كۆسۆڤۆ، رویاندەدا هەڵبداتێ.

گۆڕانی پرەنسیپی دەستتێوەرنەدان لە كاروباری دەوڵەتان كە لە میساقی نەتەوەیەكگرتوەكان چەسپێنرابوو، بۆدەستتێوەردان لەكاتی پێشێلكردنی مافی مرۆڤ، بە دەستكەوتێكی گرنگی خەبات لە پێناو چەسپاندنی تەواوی مافی مرۆڤو، گرنگترین گۆڕانی نێودەوڵەتی دادەنرێت، كە دەبێتە رێگرییەك لەبەردەم دەسەڵاتی رەهای رژێمە دیكاتاتۆریەكان، ئەو رژێمانەی پێشتر بە سانایی و بە بیانووی دەستتێوەرنەدان لە كاروباری ناوخۆییانەوە، مافی مرۆڤیان بە شێوەیەكی بەرفراوان پێشێل دەكرد.

## راهێنان

- ئایا نەتەوە یەكگرتوەكان دەتوانێت رێبگرێت لەو پێشێلكاریانەی دژ بە مافی مرۆڤ دەكرێت؟چۆن؟

- رێكخراوەكانی مافی مرۆڤ دەتوانن بە هێز، رێ لەپێشێلكارییەكان بگرن؟

- زۆرجار دەبیستین كە رژێمێكی دیاریكراو پابەندی یاسا نێودەوڵەتییەكان نابێتو پێویستە سزا بدرێ، تا رەوشی خۆی لەو رووەوە چاك دەكاتەوە، ئایا دەكرێ لایەنێكی لەو جۆرە دەستنیشان بكەیت؟

- گۆڕانی پرنسیپی دەستتێوەرنەدان لە كاروباری ناوخۆ بۆ دەستتێوەردان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

- ماوەیەكی زۆرە توركیا هەوڵی چوونە ناو یەكێتی ئەورووپا دەدات، بەڵام تا ئێستا وەرنەگیراوە، گرنگترین هۆی وەرنەگرتەكەی كامانەیە؟

## تەوەری دووەم

### ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ:

لــە وڵاتــانی کـاولکراوو بــەئاگری جــەنگ ســوتاودا، چــەندین ڕێکخــراو بــە مەبەستی چاودێریکردنی مـافی مـرۆڤو دووبـارە نەبوونـەوەی کارەسـاتەکانی هــەردوو جــەنگی جیهــانی دامــەزران. ڕێکخراوەکــان بــە شــێوەیەکی گـشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

**١- ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحکومییــەکان:** ئــەم ڕێکخراوانــە پــەلیان بـۆ هەموو دونیا هاویشتووەو لە زۆربەی دەوڵەتەکانی دونیـادا، چ بــە ئاشـکراو چ بە نهێنی، نوێنەریان هەیەو بەدوای هــەموو جـۆرە پێـشێلکارییەکدا دەگـەڕێن کە دەبنە هۆی دەرچوون لە بنەماکانی مافی مرۆڤ. خەڵکێکی زۆر لە دەوریان کۆبۆتـــەوە. ئەمـــە جگـــە لـــەوەی کـــە ســـاڵانە، ڕاپـــۆرت ســـەبارەت بـــە پێـشێکارییەکانی مـافی مـرۆڤ ئامـادەو بڵاودەکەنـەوە. لەهەمانکاتیـشدا بـۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە مافەکانیان چەندین کتێبو نامیلکـەی بـەنرخ لـە بوارە جۆراوجۆرەکانی ڕاگەیاندنەوە چـاپو پەخـشدەکەن، بـەوەش وشـیاری لـەناو خەڵکـدا بڵاودەکەنــەوە. ڕاپۆرتەکانیـشیان لــە ئاسـتی نێودەوڵەتیـدا دەنگدانەوەیەکی باشی هەیە. "ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ـ ئەمنـستی ئێنتەرنەشینالْ ـ" کەبارەگای سەرەکیی لەبەریتانیایە، "ڕێکخراوی چاودێری مــافی مــرۆڤ ـــ هیومــان ڕایــت وچ" کــە بەشێکیــشی بــۆ چــاودێریکردنی پێـشێلکارییەکانی ناوچـەی خۆرهــەڵاتی ناوەڕاسـت بــە نـاوی "میـدڵ ئیـست وچ"ەوە هەیەو بارەگاکەشی لەئەمەریکایە. "ڕێکخـراوی فەرەنـسای ئـازاد ـــ فرانس لیبەرتی" بارەگاکەی لەفەرەنسایە.

**٢- ڕێکخراوە ناحکومییە ناوچەییەکان:** ئەم ڕێکخراوانە زیـاتر ناوچـەیینو چاودێری ئەو پێشێلکاریانە دەکەن کە لەشوێنێك یان دەوڵەتێکی دیـاریکراودا ڕوودەدەن. هەندێك لـە حکومەتـە پێشێلکارەکان، بـە مەبەسـتی چاوبەسـت لەدونیا، ڕێکخراوی لەم بابەتـە لـە وڵاتـەکانیانـدا دادەمـەزرێننو کەسـانێکیش

دەبنە بەرپرس، كە لە ئاست پێشێلكارییەكانی حكومەتەكەیاندا بێدەنگبن، باشترین نموونەش لەو رووەوە رێكخراوی مافی مرۆڤی عێراقی سەردەمی بەعس و هاوشێوەكانێتی، بەلاَم مەرج نییە هەموو رێكخراوە حكومیو ناوچەییەكان لەو جۆرەبن، بەلَكو هەندێكیان رۆلَی باشیان دەبێت لە هەردوو بواری دەستەبەركردن و وشیاركردنەوەی خەلَك لەمافەكانیان و دەستنیشانكردنی پێشێلكارییەكان.

## ٣- رێكخراوە ناوخۆییە ناحكومییەكان:

ئەو رێكخراوانە دەگرێتەوە كە لە چوارچێوەی تاكە دەولَەتێكدا, سەربەخۆ لە حكومەت كار دەكەن، زۆربەیان پەیوەندییان لەگەلَ رێكخراوە ناحكومییە جیهانیو ناوچەییەكان هەیەو هەندێ جاریش لە یەك تۆڕی كاركردندا دەبن .

كاری رێكخراوە ناوخۆییەكان لە رێگەی یاسایەكەوە رێكدەخرێت كە بە یاسای كۆمەلَەو رێكخراوەكان دەناسرێت، ئەم یاسایە لە دەولَەتێكەوە بۆ دەولَەتێكی دی جیاوازە، تا دەولَەتەكە دیموكراتی بێت ئەوەندەش یاساكە كراوەو كارئاسان دەبێت بۆ دروست بون و كاركردنی رێكخراوەكان بە پێچەوانەشەوە تا دەولَەتەكە دیكتاتۆریی بێت ئەوەندە یاساكە رێگر دەبێت لە بەردەم كاری رێكخراوەكانداو هەندێ جاریش هەر رێگە نادات بە دروست بونیان تەنها ئەوانە نەبێت كە دروستكراوی خۆی دەبن.

رێكخراوە ناوخۆییە ناحكومیەكان رۆلێكی گەورەیان هەیە لە بەرەوپێشبردنی كۆمەلَی مەدەنیو چەسپاندنی پرنسیپەكانی مافی مرۆڤو دیاریكردنی ئەو پێشێلكاریانەی دەسەلاَت ئەنجامی دەدات، هەر بۆیە كۆمەلَەی گشتی نەتەوەیەكگرتوەكان لە یادی پەنجا سالَەی جاڕنامەی گەردونی مافەكانی مرۆڤدا بڕیارێكی پەسەندكردو تێیدا داوای لە حكومەتی دەولَەتەكان كرد كارئاسانی زیاتر بكەن بۆ كاری رێكخراوەكان و یاساكانیان بە جۆرێك دابڕێژن رێگری دروست نەكات لە بەردەمیاندا.

## ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی - ئەمنستی ئینتەرناشناڵ:
## Amnesty International

بۆ زیاتر روونکردنەوەی کاری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ـ ئەمنستی ئینتەرناشناڵ ـ دەکەینە نموونەیەك تا لە جۆرو ئەرك‌و چۆنێتی کاری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بگەین.



ئارمی ڕێکخراوی ئەمینستی ئینتەرناشناڵ

ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی – ئەمنستی ئینتەرناشناڵ ـ ڕێکخراوێکی خۆبەخشی جیهانیی ئەو کەسانەیە کە داوای مافی مرۆڤ دەکەن‌و کاریش بۆ پارێزگاریکردنی دەکەن. ڕێکخراوەکە بزووتنەوەیەکە، لە ئاست سەرجەم حکومەت‌و بیروڕا سیاسییەکان‌و ئایینییەکاندا سەربەخۆیە. پشتگیری‌و بەرهەڵستی هیچ حکومەت‌و ڕژێمێکی سیاسی ناکات، دیسان پشتگیری‌و بەرهەڵستی بیروڕای ئەو قوربانییانەش ناکات کە هەوڵی پاراستنی مافەکانیان بۆ دەدات. جگە لەپارێزگاریکردنێکی بێلایەنانەی مافی مرۆڤ، هیچ مەبەستێکی تری نییە. ڕێکخراوەکە کار بۆ کۆکردنەوەی خەڵکە چالاکە خۆبەخشەکان دەکات، ئەو کەسانەی بێبەرامبەر بەشێك لە هەوڵو کاتی خۆیان بۆ ئەو ئەرکە تەرخان دەکەن. ڕێکخراوەکە لەهەموو کەلێنێکی دونیادا، تۆڕی جۆراوجۆر لە ئەندام‌و لایەنگرانی خۆی هەیە. لە دوا

سەرژمێریدا، نزیکەی ملیۆنو نیوێك ئەندامو لایەنگرو هاوکاری لەزیاتر لە (١٥٠) وڵاتدا هەیەو ئەندامەکانی هەڵگری هەمەجۆر بیری رۆشنبیرییو کۆمەڵایەتیینو جیاوازییەکی گەورەش لە نێوان باوەڕە سیاسییو ئاینییەکانیاندا هەیە، بەڵام لەکارەکانیاندا بۆ هێنانەدی دونیایەك کە تیایدا هەموو کەسێك مافە مرۆڤایەتییەکانی خۆی پارێزراوبێ، هاوڕاو چونیەکن. ئەم رێکخراوە لەنزیکەی (١٠٠) وڵاتو ناوچەدا لقی دانپیانراوی خۆی کردۆتەوە، کە بە هەزاران لاوو قوتابی پسپۆڕ لەبواری مافی مرۆڤدا کاری تێدا دەکەن.

رێکخراوەکە خۆی لەدونیایەکدا دەبینێتەوە کە سەراپای خەڵکی بە هەموو مافە مرۆڤایەتییەکان، ئەو مافانەی لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤو پێوەرەکانی تری مافی مرۆڤە نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە، بگەن.

**تەوەری سەرەکی خەباتی رێکخراوەکە لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:**

خەباتکردن بۆدانانی رادەیەك لە کوشتنی سیاسییو کارەساتی "سەرەونگومکردن".

بێسڵکردنەوە، بەرهەڵستی سزای کوشتن (لەسێدارەدانو گوللەبارانکردن)و ئازاردانو ئەو شتانەی دی دەکات کە لە خانەی هەڵسوکوتی توندو تیژیی دادەنرێن.

خەباتکردن بۆ بەدەستەوەدانی پێشێلکەرانی مافی مرۆڤو سپاردنیان بە دادگا.

هەوڵدان بۆ ئازادکردنی بەندکراوانی بیروڕا، ئەوانەش بەپێی یاسای بنەڕەتی رێکخراو، کەسانێکن بەهۆی" بۆچوونی سیاسیی، ئایینی، یان هەر بۆچوونێکی دی کە لەویژدانیانەوە هەڵقوڵابێ، یان زمان، یان رەچەڵەکی نەتەوەیی، یان کۆمەڵایەتیی، یان باری ئابووریی، یان لە دایکبوون، یان هەر شتێکی دی گیرابنو توندوتیژییان بەکار نەهێنابێو بانگەشەشیان بۆ بەکارهێنانی نەکردبێ.

هەوڵدان بۆ دادگاییکردنێکی خێراو دادپەروەرانەی گیراوەکان.

بەرهەڵستیکردنی ئەو پێشێلکارییە خراپانەی کە بەرامبەر بە مافە کلتووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابوورییەکان دەکرێن.

هەوڵدان بۆ قایلکردنی کۆمپانیاو دەزگا ئابوورییەکان تا پارێزگاری مافی مرۆڤ بکەن‌و بەچاوێکی بەرز سەیری بکەن.

بەرهەڵستی ئەو پێشێلکاریانە دەکات، کە دەزگاو کەسانێکی دەری دەوڵەت، لەکاتێکدا دەیکەن، کە دەوڵەت وەك پێویست ئەرکی پارێزگاریکردنی خەڵکەکەی پێجێبەجێ نەکرێت.

بەرهەڵستیکردنی ئەو پێشێلکارییە گەورانەی دژ بە رزگاربوون لە جوداکاری دەکرێن.

یارمەتیدانی ئەو پەنابەرانەی مەترسی گەڕانەوەیان لەسەرە بۆ وڵاتێك کە دوور نییە مافە بنەڕەتییەکانیانی تیادا پێشێلکرێ.

داوا لە حکومەتەکان دەکات لە کاتی شەڕی چەکدارانەدا، نایاساییانە کەس نەکوژن.

داوا لە گروپە چەکدارەکان دەکات رادەیەك بۆ پێشێلکارییەکانیان دابنێن، وەك گرتنی خەڵکی لەسەر بیروڕا، بارمتەکردنی خەڵکی، ئازارو ئەشکەنجەدان، کوشتنی نایاسایی.

خەباتکردن بۆ دانانی رادەیەك بۆ بەسەربازکردنی منداڵان.

هاریکاریکردن لەگەڵ رێکخراوە ناحکومییەکانی دی‌و نەتەوەیەکگرتووەکان‌و رێکخراوە حکومی‌و دەوڵەتیی‌و ناوچەییەکاندا، بۆ پشتگیریی لەمافی مرۆڤ.

مسۆگەرکردنی چاودێریی پێوەندییە سەربازیی‌و ئاسایش‌و پۆلیسییە نێودەوڵەتییەکان لەپێناو پاراستنی مافی مرۆڤدا.

رێکخستنی بەرنامە بۆ فێربوونی مافی مرۆڤ‌و وشیاری زیاتر لەو بارەیەوە.

ئەم رێکخراوەو سەرجەم رێکخراوانی هاوشێوەی، فایلی جیاجیایان بۆ هەر دەوڵەتێك لەدەوڵەتانی دونیا کردۆتەوەو لیژنەیەکی سەربەخۆ سەرپەرشتی هەریەك لە فایلەکان دەکاتو بە زۆری بەرپرسی فایلەکە نابێ خەڵکی ئەو وڵاتە بێت، تا بێلایەنیەتی تیادا بە تەواوەتی بپارێزرێ..

## راهێنان

ـ ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتییانەی جێدەستیان لەپارێزگاریکردنی مافی مرۆڤدا هەیە کامانەن؟

– ئایا رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ چەك بەکاردەهێنن بۆ رێگرتن لە پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ ؟

– رێکخراوە حکومیو ناوچەییەکان بە چ رێگەیەك دەتوانن خۆیان بسەپێننو جێگەی متمانەی هاوڵاتیانی وڵاتەکەیان بن؟

– هیچ رێکخراوێکی دیکەی نێودەوڵەتیت بیستوە کە ئامانجی پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤ بێت؟ ئەگەر بیستوتە کورتە باسێکی بۆ خوێندکارانی هاورێت بکە.

## سەرچاوەكان


١- جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ.

٢- اللجنة الدولية للصليب الاحمر / الملحقان " البروتوكولان " الاضافيان الى اتفاقيات جنيف المعقود فى ١٢ آب/ ١٩٤٩ / جنيف_ ١٩٧٧.

٣- حقوقنا مجموعة انشطة وتدريبات / منظمة العفو الدولية المجموعات الفلسطينية.

٤- الشرعة الدولية لحقوق الآنسان صادرة عن مركز حقوق الانسان فى الامم المتحدة المطبوعة فى جنيف فى مايس ١٩٩٥. ترجمة الى اللغة الكوردية من النص العربى المعتمد لدى الامم المتحدة. نشر فى كوردستان فى حزيران ٢٠٠٠. الجهة المنفذة للمشروع : ( **American Society For Kurds -ASK**)

الجهة الممولة: ( **The National Endowment For Democracy - NED**)

اسم المطبعة: مطبعة التربية — أربيل

٥- سەرەتايەك بۆ تێگەيشتنی هەڵبژاردن/ محەمەد خورشيد تۆفيق — هەلێر ٢٠٠٣

٦- "دەنگی مرۆڤ" گۆڤارێكی وەرزی رێكخراوی مافی مرۆڤە لەكوردستان/ ژمارە ٤ی زستانی ٢٠٠٣/٢٠٠٤

٧- للاجئين حقوق : منظمة العفو الدولية "ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ"

٨- دەستپێك بۆ: مافەكانی مرۆڤ لەكوردستان — عێراق, د. صلاح محمد عزيز.